

لێكدانەوەی مەنزومەی

# الحَـائِـيَّة فِـــي السُّنَّـة


نووسینی

ئەبوبكری كوڕی ئەبی داودی سیجستانی

لێكدانەوە

ماموٚستا هاوكار كوردی



١٤٤٠ - ٢٠١٩

لێکدانەوەی مەنزومەی

# الحَائِيَّة فِي السُّنَّة

لە بیروباوڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت


نووسینی

ئەبوبکری کوڕی ئەبی داودی سیجستانی

لێکدانەوەی

هاوکار کوردی


1440 - 2019

## كورتەیەك لە ژیانی ئیمامی ئەبی داود

**ناو و نەسەبی** : سلێمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی ئیسحاقی کوڕی بەشیری کوڕی شەدادی کوڕی عەمری کوڕی عیمرانی ئەزەدی سیجستانی [1] ئیبن حەجەری عەسقەلانی و ئیبن عەساکیر دەفەرموون : باپیری عیمران لە شەڕی ( صفين ) لە ڕیزی سوپای ئیمامی عەلی لە بەرامبەر سوپای ئیمامی موعاویە کوژرا [2] لە ئەزەدە کە هۆزێکی دیارن لە وڵاتی یەمەن [3] وە ناوی ( السجستانی ) نیسبەتە بۆ شارێك کە دەکەوێتە بەشێکی ڕۆژئاوی وڵاتی ئەفغانستان وە بەشێکی تری دەکەوێتە وڵاتی ئێران و پاکستان .

**لە دایك بوون** : ئیمامی ئەبی داود لە سەرەتای سەدەی سێی کۆچی لە ساڵی ( 202ھ ) لە سەردەمی خیلافەتی مامون لە دەوڵەتی عەباسیەکان لە شاری سیجستان لە دایك بووە [4]

**چۆنیەتی داواکردنی زانست و گەورەبوونی** : پێشەوا ئەبی داود سەرەتای خوێندنی لە وڵاتی خۆی سیجستان بووە لە پاشان بۆ زانستی فەرمودە کۆچی کرد بۆ ویلایەتی خوراسان لەوێش لە خزمەت زانایانی سوونە خوێندی لە پاشان سەردانی وڵاتی ڕەی و هوراتو عێراقی کرد لە ساڵی 220ھ هاتە ناو شاری بەصرە لە پاشان لە ساڵی 221ھ چووە کوفە وە چەندین جار بۆ خزمەت زانایانی ئەهلی علم چووە بۆ شاری بەغدا کۆتا ساڵ کە سەردانی عێراقی کرد ساڵی 271ھ بوو دواتر کۆچی کرد بۆ وڵاتی شام کە سوریای ئێستا دەکات نزیکەی بیست ساڵ لە شاری تەرتوس لە وڵاتی شام مایەوە, وە هەروەها لە شاری دیمەشق لە خزمەت زانایان گوێ بیستی فەرموودە بووە , دواتر کۆچ دەکات بۆ وڵاتی میصر دواتر لەسەر داوای ئەمیری ئەوکاتی بەغدا ئەبی ئەحمەدی موەفەق دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا لە شاری کوفە نیشتەجێ دەبێت و قوتابیان لە هەموو سوچەکانی وڵاتان دەهاتنە خزمەتی [5]

---

(1 -2-3-4-5) تهذيب التهذيب ج : 4 ص : 169 .

**مامۆستایەکانی** : پێشەوا ئەبی داود گوێبیستی فەرمووە لە : ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی مەعین و موسلیمی کوڕی ئیبراهیم و عبدالله کوڕی ڕەجا و باوکی وەلیدی تیالیسی و سەعیدی کوڕی سلێمانی واسیتی و عاصیمی کوڕی عەلی و باوکی عەلی زەریر و حەسەنی کوڕی ڕەبیعی بورانی و ئەحمەدی کوڕی یونسیی یەربوعی ...هتد بووە [(1)]

**قوتابیەکانی** : زیاد لە هەزار قوتابی هەبووە دیارترینیان : ئیمامی تورموزی و ئیمامی نەسائی و ئەبوبکر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی خەلال و حەربی کوڕی ئیسماعیلی کیرمانی و ئیبن و ئەبی دونیا و ئیمامی رامهرموزی و ئیمامی ئیسفراییینی [(2)]

**عەقیدە و مەزهەبی** : ئیمام ئەبی داود عەقیدە سەلەف بووە و مەزهەبیش حەنبەلی بووە [(3)]

**وەسفی زانایان لەسەری** :

**یەکەم** : موسای کوڕی هارون دەفەرمووێت : ئیمامی ئەبی داود لە دونیا تەنها لە پێناو فەرمودە درووستکراوە , وە لە قیامەتیش تەنها بۆ بەهەشت , نەم بینیوە چاکتر لەو [(4)]

**دووهەم** : باوکی حاتەمی کوڕی حیبان دەفەرمووێت : یەکێکە لە زانایانی دونیا لە ڕووی فیقە و علم و زانست و عیبادەت و لە خوا ترسان خەمی تەنها کۆکردنەوەی سوونەت و بەرپەچدانەوەی ئەهلی بیدەع بووە [(5)]

**سێیەم** : ئیبن جەوزی دەفەرمووێت : زانای سەردەمی خۆی بووە بە هێزترین لەبەرکردنی هەبووە , وە شارەزاترینە بە زانستی علل , وە خاوەن تەقوایەکی زۆرە وە لە ڕووخسار و عیبادەت زۆر بە ئیمام ئەحمەد چووە [(6)]

---

(1 -2-3-4-5-6) سیر أعلام النبلاء ج : 15 ص : 308 .

**كۆچی دوایی** : له ڕۆژی هەینی 16 شەوالی ساڵی 275 کۆچی له شاری بەصره کۆچی دوایی کرد وه له تەنیشت گۆڕی پێشەوا سوفیانی سەوری نێژرا [1]

**بەرهەمەکانی** :

**یەکەم** : مراسیل .

**دووهەم** : مسائل الامام أحمد , کتێبێکی فیقهیه لەسەر مەزهەبی ئیمام ئەحمەد .

**سێ یەم** : الناسخ والمنسوخ .

**چوارەم** : سؤلات ابي عبيد محمد بن علی بن عثمان الأجري .

**پێنجەم** : رسالة أبي داود إلی أهل مكة .

**شەشەم** : الزهد لأبی داود .

**حەوتەم** : كتاب البعث والنشور .

**هەشتەم** : سؤالات أبي داود السجستاني للإمام أحمد بن حنبل في الرواة .

**نۆیەم** : دلائل النبوة .

**دەیەم** : فضائل الأنصار .

**یازدەهەم** : أخبار الخوارج .

**دوازدەهەم** : الدعاء .

**سێزدەهەم** : السنن أبی داود .

**چواردەهەم** : الحائية في السنة . ئەوەی کە ئێستا لەبەر دەستت دایە .

---

(1) سير أعلام النبلاء ج : 15 ص : 308 .

## پێناسەی ﴿ المَنْظُومَة الحَائِيَّة فِي السُّنَّة﴾

وشەی (المَنْظُومَة) شەریفی جورجیانی دەفەرمووێت : لە ( نظم ) هاتووە , وە لە زمانی عەرەبی واتە : جمع الؤلؤ في السلك [1] واتە : کۆکردنەوەی لولوە ئەوەی دنك دنك لە ڕێگا کەوتووە

وە لە پێناسەی زانایان واتە : تأليف الكلمات والجمل مترتبة المعاني [2] واتە : تێك خستنی چەند وشە و ڕستەیەکە کە بینا کراوە لەسەر واتا .

وە وشەی (الحَائِيَّة) واتە : پیتی ( ح ) کە کۆتایی دێڕەکانی ئەم مەنزومەیە بە پیتی ( ح ) کۆتایی پێ هاتووە گەر سەیری مەنزومەکە بکەیت بە ڕوونی دیارە , ئێمە هاوشێوەی ئەم جۆرە مەنزومەمان هەیە کە کۆتایی وەزنی مەنزومەکە بە پیتێك لە پیتەکان هاتووە وەك : مەنزومەی لامیەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و نونیەی ئیبن قەیم و میمیەی ئەبی ئیسحاق ...هتد ,

وشەی (فِي السُّنَّة) واتە : لە بیروباوڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت .

---

(1-2) تعريفات , باب النون , ج : 1 ص : 242 .

**ژمارەی بەیتەكانی ئەم مەنزومەیە چەندە ؟**

**ئەم مەنزومەیە تەنها سی و سێ بەیتە زیاد لە قوتابیەك ئەم مەنزومەی گێڕاوەتەوە بەبێ زیاد و كەم ئەوانیش ئەوانەن :**

**یەكەم : پێشەوای عەلامە باوكی حەفص عومەری كوڕی ئەحمەدی كوڕی شاهین**

**ئیمامی زەهەبی دەفەرمووێت : أنشدنا أبو العباس أحمد بن عبد الحميد، قال: أنشدنا الإمام أبو محمد بن قدامة سنة ثمان عشر وست مائة، أخبرتنا فاطمة بنت علي الوقاياتي أخبرنا علي بن بيان، أخبرنا الحسين بن علي الطناجيري حدثنا أبو حفص بن شاهين أنشدنا أبو بكر بن أبي داود لنفسه هذه القصيدة وجعلها محنته وذكر الأبيات [1]**

**دووهەم : ئیمامی ئەبوبكری ئاجوڕی لە كتێبی ( الشريعة ) دەفەرمووێت : أملى علينا أبو بكر ابن أبي داود في مسجد الرصافة في يوم الجمعة لخمس بقين من شعبان سنة تسع وثلاث مائة ... وذكر الأبيات [2] واتە : ئەبی داود لە مزگەوتی ڕەسافە ...ئەم قەسیدەیەی بۆمان خوێندەوە .**

**سێ یەم : ئیمامی عەلامە عبیداللە فقیه دەفەرمووێت : قال ابن أبي يعلى في طبقات الحنابلة: أنبأنا علي المحدث عن عبيد الله الفقيه قال: أنشدنا أبو بكر ابن أبي داود من حفظه لنفسه وذكر الأبيات [3]**

**چوارەم : عەلامە ئەبوبكر ئەحمەدی كوڕی ئیبراهیم دەفەرمووێت : فەقیە باوكی حەسەن عەلی كوڕی محمد معافری مالقی فەرمووی : أنشدنا أبو بكر عبد الله بن سليمان بن الأشعث لنفسه في السنة رحمه الله. وذكر الأبيات [4]**

---

(1) سير أعلام النبلاء (233/13)
(2) الشريعة (2563/5)
(3) طبقات الحنابلة (53/2)
(4) الحدائق الغناء (ص 176)

ئەمانە گشتی بەڵگە بوون لەسەر جێگیربوونی دووشت :

**یەکەم** : بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم مەنزومەیە لە دانەری پێشەوای سوونەت ئەبی داودە.

**دووهەم** : ئەم مەنزومەیە پێك هاتووە لە سی و سێ بەیت .

بەڵام ڕیوایەت کراوە کە گوایە چل بەیتە ئەم بەیتانەی کە زیادە ئەمانەن :

وسبطي رسول الله وابني خديجة ... وفاطمة ذات النقا أمدح
وعائش أم المؤمنين وخالنا ... معاوية أكرم به ثم امنح
وأنصاره والمهاجرون ديارهم ... بنصرتهم عن كبة النار زحزحوا
ومن بعدهم فالتابعون لحسن ما ... حذوا فعلهم قولاً وفعلاً فأفلحوا
ومالك والثوري ثم أخوهم ... أبو عمر الأوزاعي ذاك المسبح
ومن بعدهم فالشافعي وأحمد ... إماما هدى من يتبع الحق يفصح
أولئك قوم قد عفا الله عنهم ... وأرضاهم فأحبهم فإنك تفرح

بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و درووستمان نیە کە ئەم بەیتانەی لە نووسینی ئەبی داود بن بە بەڵگەی ئەوەی کە قوتابیەکانی ئەم بەیتانەیان لێ گوێ بیست نەبووە بەڵکو بەڵگەمان هەیە کە ئی زیادەی پێشەوای زانای عەلامەی محقق ئیبن بەننایە [1]

---

(1) لوائح الأنوار السنية (105/2)

## پێشەکی مامۆستا هاوکار کوردی

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**سوپاس و پێزانین بۆ پەروەردگار کە جارێکی تر کات و دەرفەتی پێدامەوە بچمە خزمەت بابەتێکی تر لە بابەتەکانی زانستی شەرعی , ئەویش ڕاڤە و لێکدانەوەی مەنزومەیەکی زانستی لەسەر بیروباوڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بەناوی ﴿الحَائِيَّة فِي السُّنَّة﴾لە نووسینی : زانای پایە بەرز ئەبی داودی سیجستانی ڕەحمەتی پەروەردگار برژێ بەسەریدا کە مەنزومەیەکی کورت و پوختە کە تەواوی بیروباوڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەتی تێدا کۆکردۆتەوە لە بابەتەکانی : وەسیەت کردن بە دەست گرتن بە قورئان و سوونەت و بابەتی ناو و سیفاتەکانی پەوەردگار و فەزڵی هاوەڵان و پێناسەی ئیمان و باسی بیروباوڕی گرووپەکانی تر و ...هتد کە بە شێوەیەکی کورت و پوخت لەم مەنزومەیە هێناویەتی و باسی کردووە ئێمەش بە شێوەیەکی کورت و پوخت بە ئەندازەی بچوکی مەنزومەکە ڕاڤە و لێکدانەوەیەکی پوخت و جوانمان بۆ ئەم مەنزومەیە کردووە , داواکارم لە پەروەردگار بە نیەتێکی پاك لێم وەرگرێت و بیخاتە تەرازووی چاکەکانم وە داواکارم لە پەروەردگار لەسەر ئەم ڕێگا ڕاستەی تەوحید و سوونەت ژیان و مردنمان پێ ببەخشێت وە من و گشت خوێنەری ئەم مەنزومەیە لە بەهەشتەکەی لە خزمەت پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان کۆمان بکاتەوە ...اللهم امين .**

**براتان موحتاج بە نزای خێر**

**هاوکار کوردی**

**کوجا تبە – ئەستەنبوڵ –تورکیا**

1- تَمَسَّكْ بِحَبْلِ اللهِ وَاتَّبِعِ الهُدَى          وَلاَ تَكُ بِدْعِيًا لَعَلَّكَ تُفْلِحُ
2 - وَدِنْ بِكِتَابِ اللهِ وَالسُّنَنِ الَّتِي          أَتَتْ عَنْ رَسُولِ اللهِ تَنْجُو وَتَرْبَحُ
3 – وَقُلْ : غَيْرُ مَخْلُوْقٍ كَلاَمُ مَلِيكِنَا          بِذَلِكَ دَانَ الأَتْقِيَاءُ وَأَفْصَحُوا
4 - وَلاَ تَكُ فِي الْقُرْآنِ بِالْوَقْفِ قَائِلاً          كَمَا قَالَ أَتْبَاعٌ لِجَهْمٍ وَأَسْجَحُوا
5 - وَلاَ تَقُلْ : القُرْآنُ خَلْقٌ قَرَأْتُهُ          فَإِنَّ كَلاَمَ اللهِ بِاللَّفْظِ يُوضَحُ
6 – وَقُلْ : يَتَجَلَّى اللهُ لِلْخَلْقِ جَهْرَةً          كَمَا الْبَدْرُ لاَ يَخْفَى وَرَبُّكَ أَوْضَحُ
7 - وَلَيْسَ بِمَوْلُودٍ وَلَيْسَ بِوَالِدٍ          وَلَيْسَ لَهُ شِبْهٌ تَعَالَى الْمُسَبَّحُ
8 - وَقَدْ يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ هَذَا وَعِنْدَنَا          بِمِصْدَاقِ مَا قُلْنَا حَدِيثٌ مُصَرِّحُ
9 - رَوَاهُ جَرِيرٌ عَنْ مَقَالِ مُحَمَّدٍ          فَقُلْ مِثْلَ مَا قَدْ قَالَ فِي ذَاكَ تَنْجَحُ
10 - وَقَدَ يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ أيْضَاً يَمِيْنَهُ          وَكِلتَا يَدَيْهِ بِالفَوَاضِلِ تَنْفَحُ
11 - وَقُلْ : يَنْزِلُ الْجَبَّارُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ          بِلاَ كَيْفَ جَلَّ الْوَاحِدُ الْمُتَّمَدِّحُ
12- إِلَى طَبَقِ الدُّنْيَا يَمُنُّ بِفَضْلِهِ          فَتُفْرَجُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ وَتُفْتَحُ
13- يَقُولُ أَلاَ مُسْتَغْفِرٌ يَلقَ غَافِرَاً          وَمُسْتَمْنِحٌ خَيْرَاً وَرِزْقَاً فَيُمْنَحُ
14- رَوَى ذَاكَ قَوْمٌ لاَ يُرَدُّ حَدِيثُهُمْ          أَلاَ خَابَ قَوْمٌ كَذَّبُوهُمْ وَقُبِّحُوا
15- وَقُلْ : إِنَّ خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ مُحَمَّدٍ          وَزِيرَاهُ قِدْمَاً ثُمَّ عُثْمَانُ الأَرْجَحُ
16- وَرَابِعُهُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ بَعْدَهُمْ          عَلِيٌّ حَلِيفُ الْخَيْرِ بِالْخَيْرِ مُنْجِحُ
17- وَإِنَّهُمْ وَالرَّهْطُ لاَ رَيْبَ فِيهِم          عَلَى نُجُبِ الْفِرْدَوْسِ بِالخُلْدِ تَسْرَحُ
18- سَعِيدٌ وَسَعْدُ وَابْنِ عَوْفٍ وَطَلْحَةٌ          وَعَامِرُ فَهْرٍ وَالزُّبَيْرُ الْمُمَدَّحُ
19- وَقُلْ خَيْرَ قَوْلٍ فِي الصَّحَابَةِ كُلِّهِمْ          وَلاَ تَكُ طَعَّانَاً تَعِيْبُ وَتَجْرَحُ
20- فَقَدْ نَطَقَ الْوَحْيُ الْمُبِينُ بِفَضْلِهِمْ          وَفِي الْفَتْحِ آيٌ فِي الصَّحَابَةِ تَمْدَحُ
21- وَبِالْقَدَرِ الْمَقْدُورِ أَيْقِنْ فَإِنَّهُ          دِعَامَةُ عِقْدِ الدِّينِ، وَالدِّينُ أَفْيَحُ
22- وَلاَ تُنْكِرَنْ جَهْلاً نَكِيرَاً وَمُنْكَرَاً          وَلاَ الْحَوْضَ وَالْمِيزَانَ إِنَّك تُنْصَحُ
23- وَقُلْ يُخْرِجُ اللهُ الْعَظِيمُ بِفَضْلِهِ          مِنَ النَّارِ أَجْسَادَاً مِنَ الْفَحْمِ تُطْرَحُ
24- عَلَى النَّهْرِ فِي الْفِرْدَوْسِ تَحْيَا بِمَائِه          كَحِبِّ حَمِيلِ السَّيْلِ إِذَا جَاءَ يَطْفَحُ
25- وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ لِلْخَلْقِ شَافِعٌ          وَقُلْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ : حَقٌ مُوَضَّحُ
26- وَلاَ تُكْفِرَنْ أَهْلَ الصَّلاَةِ وَإِنْ عَصَوْا          فَكُلُّهُمُ يَعْصِي وَذُو الْعَرْشِ يَصْفَحُ
27- وَلاَ تَعْتَقِدْ رَأْيَ الْخَوَارِجِ إِنَّهُ          مَقَالٌ لِمَنْ يَهْوَاهُ يُرْدِي وَيَفْضَحُ
28- وَلاَ تَكُ مُرْجِيًّا لَعُوبَاً بِدِيْنِهِ          أَلاَ إِنَّمَا الْمُرْجِيُّ بِالدِّينِ يَمْزَحُ
29 - وَقُلْ: إِنَّمَا الإِيمَانُ: قَوْلٌ وَنِيَةٌ          وَفِعْلٌ عَلَى قَوْلِ النَّبِي مُصَرَّحُ
30 - وَيَنْقُصُ طَوْرَاً بِالْمَعَاصِي وَتَارَةً          بِطَاعَتِهِ يَنْمِي وَفِي الْوَزْنِ يَرْجَحُ
31 - وَدَعْ عَنْكَ آرَاءَ الرِّجَالِ وَقَوْلَهُمْ          فَقَوْلُ رَسُولِ اللهِ أَزْكَى وَ أَشْرَحُ
32 - وَلاَ تَكُ مِنْ قَوْمٍ تَلَهَّوْا بِدِينِهِمْ          فَتَطْعَنَ فِي أَهْلِ الْحَدِيثِ وَتَقْدَحُ
33 - إِذَا مَا اعْتَقَدْتَ الدَّهْرَ يَا صَاحِ هَذِهِ          فَأَنْتَ عَلَى خَيْرٍ تَبِيتُ وَتُصْبِحُ

هَذَا قَوْلِي، وَقَوْلُ أَبِي، وَقَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ رَحِمَهُ اللهِ، وَقَوْلُ مَنْ أَدْرَكْنَا مِنْ أَهْلِ الْعِلمِ وَقَوْلُ مَنْ لَمْ نُدْرِكْ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ مِمَّنْ بَلَغَنَا قَوْلَهُ، فَمَنْ قَالَ عَلَيَّ غَيْرَ هَذَا فَقَدْ كَذَبَ.

## الاعتصام بالكتاب والسنة ومجانبة البدع

| | |
|---|---|
| 1- تَمَسَّكْ بِحَبْلِ اللهِ وَاتَّبِعِ الهُدَى | وَلاَ تَكُ بِدْعِيًا لَعَلَّكَ تُفْلِحُ |
| 2 - وَدِنْ بِكِتَابِ اللهِ وَالسُّنَنِ الَّتِي | أَتَتْ عَنْ رَسُولِ اللهِ تَنْجُو وَتَرْبَحُ |

**﴿ دەست گرتن بە قورئان و سوونندت و دووركەوتنەوە لە بیدعە ﴾**

**دانەری نەزم لە سەرەتای هەڵچنینی ئەم مەنزومەیە وەسیەت و ئامۆژگاری بە دوو شت دەكات ئەویش : دەست گرتن بە قورئان و سوونەت وە دووركەوتنەوە لە بیدعە و شوێن كەوتوانی پێش ئەوەی باسی باسە بیروباوڕیەكان بكات ئامۆژگاری بەم دوو شتە كرد بۆ ئەوەی ببێتە دەست پێكێك بۆ دامەزراندنی بیروباوڕی تاك لەسەر سەرچاوەی قورئان و سوونەت وە وەك سوونەتێك و چاوتێكردنێكی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كە هەركاتێ بەسەر مینبەر بكەوتبا دەیفەرموو** ﴿ أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشر الأمور محدثاتها ﴾ [1] **واتە : لەپاشاندا : بەڕاستی ڕاسترین وتە وتەی پەروەردگارە وە باشترین ڕێباز و بەرنامە ڕێگا و سوونەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم , وە خراپترینی كارەكان زیادە و داهێنانە لە دین .**

**وە وەك چاوتێكردنی لە زانایانی سەلەف كە ئەوانیش هەمیشە ئامۆژگاریان بە قورئان و سوونەت و دووركەوتنەوە لە زیادە سەرخستنی دین كردووە , وەك پێشەوا ئەوزاعی دەفەرموویێت** ﴿ندور مع الكتاب والسنة حيث دارا﴾ [2] **واتە : ئەڕۆین لەگەڵ قورئان و سوونندت لەهەر جێگایەك و كاتێك بین**

---
(1) سنن إبن ماجه , ج : 11 ص: 116 , برقم : 20076 . حكم الحديث : حسن
(2) الأثر المشهور عن الإمام مالك رحمه الله في صفة الاستواء دراسة تحليلية ص : 16.

وه پێشهوا و شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموویت ﴿لیس الاعتقاد لي ولا لمن هو أكبر مني الاعتقاد لله ولرسوله صلى الله عليه وسلم﴾ [1] واته : بیروباوڕی من نیه وه له من گەورتریش له زانایانی پێش خۆم له سەلەف ئەگەر بیروباوڕی قورئان و سوونەت نەبێت .

بۆیه هەمیشه زانایانی کۆن و نوێ وەسیەت و ئامۆژگاری دەست گرتن به قورئان و سوونەت و دوورکەوتنەوه له زیاده داهێنان له دیندا دەکەن ئەوەش له پێناو پاراستنی بیروباوڕێکی سەلامەت و تەندرووسته بۆ تاکی موسڵمان بۆ ئەوەی بزانێت که چی و چی سەرچاوه و شوێنه گەڕانەوەی کارەکانه بۆ ئەوەی بپارێزرێیت له بیروباوڕه نامۆ و پوچەکانی ڕۆژگارەوە که زادەی عەقڵی کورتی مرۆڤه .

﴿تَمَسَّكْ﴾ : له زمانی عەرەبی واته (الأخذ بالشيء والاعتصام به ) گرتن به شتێك وه دەست گرتن پێیەوه , ئەوەش دیاره له وتەی پەروەردگار وەرگیراوه که دەفەرموویت ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً﴾ [2] واته : دەست بگرن به پەتی پەروەردگارەوە که " قورئان و سوونەته " وه جیامەبنەوه له کۆمەڵەی موسڵمانان , یاد و خواسی ئەم بەخشیشەی پەروەردگار بکەن که بەسەرتانەوەیه ئەویش ئەوەیه که ئێوه دوژمنی یەك بوون پەروەردگار دڵی بەیەك بەستنەوه و بوون به برا .

﴿بِحَبْلِ اللَّهِ﴾ پەتی پەروەردگار وتەی ڕاڤه و شیکارکارانی ئایەتەکانی پەروەردگاری زۆر لەسەره هەندێك دەفەرموون به واتای ( وشەی تەوحید لا اله الا الله ) دێت وه هەندێکیش دەفەرموون بەواتای ( قورئان و سوونەتی سەحیحی پێغەمبەر دێت صلى الله عليه وسلم ) وه پێشەوا ئیبن قەیم دەفەرموویت : مەبەست له پەتی پەروەردگار لەو نەزمەی ئەبی داود **قورئانه** بەبەڵگەی ئەوەی چوونکه دوای ئەو باسی سوونەت و شوێنکەوتنی سوونەت دەکات .

---

(1) مجموع الفتاوى , ج : 3 ص: 203.
(2) سورة آل عمران , أية : 103.

**﴿وَاتَّبِعِ الهُدَى﴾ مەبەست لە دانەر لێرە : سوونەتی سەحیحی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم کە دوای وەسیەت کردنی بە پەتی پەروەدگار کە سەرچاوەی یەکەمە بۆ تەشریع وەسیەتی سەرچاوەی دووهەم دەکات کە ئەویش سوونەتە بە ڕێنمویی وەسفی دەکات .**

**( الهدى ) ئەگەر لەناو قورئان و سوونەت ناوی هێنرا بە دوو واتا دێت :**

**یەکەم : هداية التوفيق واتە : ڕێنمویی تەوفیق بوون کە ئەوە بەدەستی پەروەردگارە و لەدەستی هیچ درووستکراوێك نیە وەك پەروەردگار دەفەرموویێت ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ [1] واتە : ئەی محمد تۆ ناتوانی هیدایەت و ڕێنمویی ئەو کەسە بکەیت کە خۆشت دەوێت , بەڵکو تەنها پەروەردگار ئەم هیدایەت و ڕێنموییەی لە دەستە وە هەربەخۆشی دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە .**

**دووهەم : البيان والإرشاد واتە : ڕوونکردنەوە و ئامۆژگاری کە ئەوە کاری بانگخوازانە کە ئەو هیدایەتە کە قورئان و سوونەتە بگەیەنن بەو کەسانەی کە کە پێویستیان پێیە , وەك پەروەردگار دەفەرموویێت ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ [2] واتە :وە چەند کەسێکمان لێکردنە سەرکردەوە و پێشەوا چوونکە لە ئایندەدا بە فرمانی ئێمە ڕێنمویی خەڵکمان پێدەکرد و ئارامیان گرت و شانیان دا بەو دینە کە بەڕاستی ئەوان بڕوا و دڵنیایی تەواویان بە ئایەتەکانی ئێمەوە هەبوو .**

(1)سورة القصص , أية : 56.
(2) سورة السجدة , أية : 24.

﴿وَلاَ تَكُ بِدْعِيًا﴾ مەبن بەو کەسانە کە زیادەیان لە دین داهێنا , پێشەوا ئەبی داود ئاماژە بە شتێکی گرینگ دەکات ئەویش ئەوەیە : ئەگەر هاتوو دەستت نەگرت بە قورئان و سووننەت لە خۆتت دارنی ئەوە دەبیتە شوێنکەوتەی گومرایان کە زیادەیان خستە دینەوە , بۆیە لە پێشدا ئامۆژگاری کردی کە دەست بگرە بە قورئان و سووننەتەوە وە لەو کەسانە مەبە کە زیادەیان خستە دینەوە , پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت ﴿مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ، فَهُوَ رَدٌّ﴾ [1] واتە : هەرکەسێ شتێك دابنێت و زیادی بکات لەسەر فەرمانەکانی ئێمە ئەوە هیچی وەرناگرێت و ڕەت دەکرێتەوە .

وە خراپترین کار و پیسترین کار داهێنانە لە دبن وەك فەرموودەکەی پێشوو باسمان کرد کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت ﴿وشر الأمور محدثاتها﴾ واتە : خراپترینی کارەکانیش زیادە خستنە سەر دینە . وە لە ڕیوایەتی لاواز هاتووە ﴿وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ﴾ [2] وأتە : وە هەموو داهێنانێك لە دین زیادەیە , وە لە ڕیوایەت و زیادەیەکی تری لاواز هاتووە ﴿وكل ضلالة في النار﴾ [3] واتە : وە هەموو زیادەیەك گومڕایە و بۆ دۆزەخە ,

﴿لَعَلَّكَ تُفْلِحُ﴾ بە ئومێدی ئەوەی سەرفراز بیت , ئەوەش بەرهەمی دەست گرتن بە قورئان و سووننەت و دوورکەوتنەوەیە لە زیادە خسستنە سەر دین , وشەی " الفلاح " ناوێکی گشتگیرە بۆ کۆکردنەوەی هەموو خێر و پاداشتێك , وە بە دڵنیایی دەست گرتن بە قورئان و سووننەت و دوورکەوتنەوە لە بیدعە گەورەترین سەرفرازیە بۆ موسڵمان , وەك لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی ﴿ما ارتدى أحدٌ بالكلام فأفلح﴾ [4] واتە : کەسێکم نەبینیوە لە گەڕابێتەوە لە علم الكلام ئیلا سەرفراز و سەرکەوتوو بووە , وە پێشەوا شافعی کاتێ موناقەشەی بیشری مورەیسی کرد فەرمووی ﴿لا تفلح﴾ دڵنیابن سەرکەوتوو نابێت .

---

(1)صحيح البخاري ,كتاب : الصلح , باب : إذا اصطلحوا على صلح جور , ج : 3 ص : 184 , برقم : 2697.
(2) مسند الإمام أحمد برقم : 17144 , قال شعيب الأرنؤوط : حديث صحيح رجاله ثقات .
(3) السنة للمروزي , ص : 28 , حكم الزيادة : ضعيف جدا .
(4) درء تعارض العقل والنقل ج : 1 ص : 5

پەروەردگار لە سەرەتای سورەی " البقرة " چەند سیفەتێکی بڕواداران باس دەکات و لە کۆتایی دەفەرموویێت ﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [1] واتە : ئا ئەوانە لەسەر هیدایەتێکن لەلایە پەروەردگارەوە وە هەر ئەوانە سەرکەوتوو و سەرفرازن .

وشەی ( لعلك ) مەبەست لێرە بۆ " الترجي " ئومێد خواستن نیە , نا بەڵکو دەست گرتن بە قورئان و سوونەت بەرهەمەکەی بە دڵنیایی سەرکەوتوو و سەرفراز دەبێت , مەبەست ئەوەیە بە دڵنیایی سەرکەوتوو دەبیت .

﴿وَدِنْ﴾ فیعلی ئەمرە , فەرمانە لە فیعلی دان يدين ديناً هاتووە واتە : هەڵسە بەجێبەجێ کردنی دینەکەت لەسەر قورئان و سوونەت و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و وازهێنانی ڕێگریەکانی , بڕوات بە هەمووی هەبێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکان بیت و ملکەچی تەواوی حوکم و شەریعەت بیت و دووربکەویتەوە لە هەموو بەرنامەیەکی کوفری وەك : عەلمانی و دیموکراسی و لیبراڵی و ڕادیکاڵی و شیوعیەت و هتد .

﴿بِكِتَابِ اللهِ وَالسُّنَنِ الَّتِي﴾ هەڵسە بە جێبەجێ کردن و گوێڕایەڵی کردنی فەرمان و نەهیەکانی قورئان وە (وَالسُّنَنِ الَّتِي ) " السُّنَنِ" کۆی " سنة" مەبەست لێرە : ئەم فەرموودە سەحیح و جێگیرانەیە کە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جێگربووە بۆ دڵنیابوونەوە و تەکید کردنی ئەم مەبەستەش ئەبی داود دەفەرموویێت :

﴿الَّتِي أَتَتْ عَنْ رَسُولِ اللهِ﴾ کە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە و جێگیربووە لە فەرموودە سەحیحەکان جا چ متواترەکان چ خەبەری ئاحاد لە هەموو بوارەکانی شەریعەت بە تایبەت عەقید و بیروباوڕ .

---

(1)سورة البقرة , أية : 5 .

﴿تَنْجُو وَتَرْبَحُ﴾ به دەست گرتن به قورئان و سوونەت وە هەڵسان به جێبەجێ کردن و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکان و نەهیەکانی هەردووکیان و وە دوور کەوتیەوە لە داهێنان و زیادە خستنە سەر دین ئەوە ئەوکات : تَنْجُو ڕزگارت دەبێت , لەبەر ئەوەی وشەی ( تنجو ) بە گشتگیری هێناوە واتە : ڕزگارت دەبێت لە هەموو بەڵا و ناخۆشیەکانی دونیا و دواڕۆژ , وە وشەی (تَرْبَحُ) کە لە نێوان " تنجو و تربح " واو هەیە لە زمانی عەرەبی پێی دەڵێن " حرف عطف " وە دڵنیاکردن و زیادە سوودە بۆ ڕزگاربوونەکە کەواتە هەم ڕزگارت دەبێت ئەم قازانج دەکەیت تەنها بە دەست گرتنت بە قورئان و سوونەت و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و نەهیەکانی .

پوختەی ڕاڤە : ئەبی داود لەم نەزمە دەفەرموویێت : دەست بگرە بە پەتی پەروەردگارەوە وە بەدوای ڕێگا و ڕێچکەی هیدایەت بکەوە , نەکەی زیادە بخەیتە دینەوە , بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت , هەستە بە جێبەجێ کردن و گوێڕایەڵی قورئان و سووننەتی سەحیحی جێگری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم , بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرکەوتوو بیت .

## صفة الكلام

3 – وَقُلْ : غَيْرُ مَخْلُوْقٍ كَلاَمَ مَلِيكِنَا بِذَلِكَ دَانَ الأَتْقِيَاءُ وَأَفْصَحُوا
4 - وَلاَ تَكُ فِي الْقُرْآنِ بِالْوَقْفِ قَائِلاً كَمَا قَالَ أَتْبَاعٌ لِجَهْمٍ وَأَسْجَحُوا
5 - وَلاَ تَقُلْ : الْقُرْآنُ خَلْقٌ قَرَأْتُهُ فَإِنَّ كَلاَمَ اللهِ بِاللَّفْظِ يُوضَحُ

### ﴿ سیفەتی وشەی پەروەردگار ﴾

پێشەوا ئەبی داود : پاش ئەوەی وەسیەتی دەست گرتن بە قورئان و سوونەتی کرد دوای ئەوە دێت باسی چۆنیەتی باوڕبوون بە سەرچاوەی یەکەم دەکات کە قورئانە چوونکە لەو سەردەمەی ئیمام فیتنەی سیفەتی ئەم قورئانە درووست بوو جا ئیمام دێت بەیانی بیروباوڕی ئەهلی سوونەت دەکات لەوبارەیەوە و دەفەرمووێت :

﴿وَقُلْ﴾ : بلێ : کێ بلێ ؟ ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری کردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەکان و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بلێ :

﴿غَيْرُ مَخْلُوْقٍ كَلاَمَ مَلِيكِنَا] وتەی پادشاکەمان درووستکراو نیە , ئەمە دوو فەرمانی پەیوەستمان بە سیفەتی کەلامی پەروەردگار بۆ جێگیر دەکات :

**فەرمانی یەکەم** : کەلامی پەروەردگار سیفەتێکی ئەوە نەوەك درووستکراو , قورئان کەلامی پەروەردگارە نەوەك وەك کەلامی یەکێك لە درووستکراوەکانی , وە پاڵدانی کەلام بۆلای پەروەردگار لە ڕووانگەی پاڵدانی سیفەتە بۆلای وەسف کراو نەوەك لە ڕووانگەی درووستکراو بۆلای درووستکار .

پاڵدان " الإضافة " بۆلای پەروەردگار دووجۆرە :

یەکەم : مظاف إلى الله من باب إضافة الصفة إلى الموصوف واتە : پاڵدان بۆلای پەروەردگار لە ڕووانگەی پاڵدانی سیفەتە بۆلای وەسف کراو نمونە : بیستنی پەورروەردگار , بینینی پەروەردگار دەسەڵات و توانای پەروەردگار , کەلامی پەروەردگار , زانستی پەروەردگار , ئەگەر هاتوو سیفەت پاڵ بدرێت دەبێت وەسف کراوێك هەبێت سیفەتەکەی پاڵدرابێت بۆلای .

دووهەم : مضاف إلى الله من باب إضافة المخلوق إلى الخالق واتە : پاڵدان بۆلای پەروەردگار لە ڕووانگەی پاڵدانی درووستکراو بۆلای درووستکار نمونە : بەندەی پەروەردگار , ماڵی پەروەردگار وشتری پەروەردگار , لەم ڕووانگەیەوە دوو گرووپ لارێ بوون و سەری هەڵدا : موعتەزیلیەکان و غولاتی ئەشعەریەکان.

﴿كَلَام َمَلِيكِنَا﴾ واتە : سیفەت و کەلامی پەروەردگارە بەو شێوەی کە خۆی شایستەیەتی , وەك سەلەف دەفەرموون ﴿إذا أردت أن تعرف الفرق بين كلام الله وكلام المخلوقين فهو كالفرق بين الخالق والمخلوق ﴾ واتە : ئەگەر دەتەوێت جیاوازی نێوان کەلامی پەروەردگار و کەلامی درووستکراوەکان بکەیت ئەوە وەك جیاوازی نێوان درووستکار و درووستکراو وایە .

قاعیدە و بنەمایەك هەیە لای ئەهلی علم ئەویش ئەوەیە ﴿أن الإضافة تقتضي التخصيص فعندما يضاف الكلام إلى الله فأنه يخصه ويليق بجلاله وكماله، وعندما يضاف الكلام إلى المخلوق فيخصه ويليق بعجزه ونقصه، ولا يلزم من اتفاق الشيئين في الاسم أن يتفقا في الحقيقة والمسمى. هذا بين المخلوق والمخلوق، فكيف بين المخلوق والخالق﴾ واتە : پاڵدان تایبەت دەکرێت , کاتێ ئێمە کەلامان دایە پاڵ پەروەردگار ئەوە تایبەت دەبێت بەو بەو شێوەی کە شایستەی خۆیەتی و لە تەواوبوونی دایە , بەڵام ئەگەر کەلامان دایە پاڵ درووستکراوەکان ئەوە تایبەت دەبێت بە ئەو وەك چۆن شایەنێتی لە وەستەوەسان و نا تەواوی , وە هەرگیز پێویست نابێت گە دوو شت لە ناوێك کۆبوونەوە ئەوە لە ناوەرۆك وابێت , ئەوە لە نێوان درووستکراوەکان وابێت ئەی چی لە نێوان درووستکراو و درووستکار ئەوە هەر زۆر دوورە .

**فەرمانی دووهەم : وَغَيْرُ مَخْلُوْقٍ واتە : دروووستكراو نیە , ئەوەش وەك وەڵامێكە بۆ ئەو كەسانەی كە دەڵێن قورئان دروووستكراوە , بەتاڵی ئەم بیروباوەڕە پوچە دەكاتەوە , وەك جەهمیەكان و موعتەزیلیەكان و زۆرینەی ئەشعەریەكانیش.**

**لای جەهمیەكان : بە ڕوونی دەڵێن : قورئان دروووستكراوە , كەلام دروووستكراوە , ناڵێن قورئان كەلامی پەروەردگار .**

**وە موعتەزیلیەكان : كەلام پاڵ دەدەن بۆلای پەروەردگار بەڵام لە ڕووانگەی دروووستكراو بۆلای دروووستكار .**

**بە هەمان شێوە كولابیەكان و ئەشعەرییەكانیش بانگەوازی دروووستكراوی قورئان دەكەن , بەڵام بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ ناڵێن بەڵكو دەڵێن : كەلام دوو جۆرە :**

**یەكەم : كەلامی نەفسی نە پیتە نە دەنگە وە ئەوە پاڵدەدەنە بۆلای پەروەردگار .**

**دووهەم : كەلامی لەفزی كە پێكهاتووە لە پیت و دەنگ ئەوەش قورئانە كە پەروەردگار قسەی پێ كردووە .**

**جا بۆیە دێڕی (وَغَيْرُ مَخْلُوْقٍ) هەموو ئەم قسە پوچانە هەڵدەوەشێنتەوە , بۆیە دەڵێین : قورئان كەلامی پەروەردگارە بە پیت و دەنگیەوە جوبریل سەلامی پەروەردگاری لێبێت لە پەروەردگاری بیستووە ئەویش بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناردووە و بەسەری خوێندووتەوە نە پیت بەبێ دەنگ دەبێت نە دەنگیش بەبێ پیت .**

(كَلاَمَ مَلِيكِنَا ) لێرە جێگری سیفەتی ملك بۆ پەروەردگار دەكات , پەروەردگاری پادشای پادشاكانە وە هەموو مولك و دەسەڵات هەر بۆ ئەوە , وەك پەروەردگار دەفەرموویێت ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [1] واتە : بڵێ پەروەردگارا ئەی خاوەن هێز و دەسەڵات , هەركەسێ خۆت بتەوێت دەسەڵات و مولكی پێ دەدەیت وە هەر كەسێ بتەوێت لێی دەسێنیتەوە , هەر كەسێ خۆت بتەوێت باڵا دەست و عەزیزی دەكەیت وە هەر كەسێ بتەوێت سوك و ڕسوای دەكەیت , گشت خێر و چاكەیەك بەدەستی خۆتە , بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێكدا توانا و دەسەڵاتداریت .

﴿بِذَلِكَ﴾ ئاماژەیە بۆ دێڕی یەكەم لە سیفەتی كەلامی پەروەردكار .

﴿دَانَ الأَتْقِيَاءُ﴾ واتە : بیروباوڕت وابێت وە بڕوای تەواوت بەوە هەبێت كە قورئان كەلامی پەروەردگارە , وەك چۆن پارێزگاران لە خوا ترسان بیروباوڕیان وابووە , لەبەر زۆری بەڵگەكان و كورتی ڕاڤەكەمان وتەی زانایان لەسەر درووستكراوی قورئان بێ ژمارە زۆرە بۆیە بگەڕێنەوە بۆ كتێبەكانی سوونەن وەك سونەی ئیمامی عیداللە و ئیمامی بەربەهاری و ئیمامی لالكائی و ئیبن قەیم و مامۆستاكەی ئیبن تەیمیە .

﴿وَأَفْصَحُوا﴾ پاڵدارە بۆلای دێڕی یەكەم واتە : ڕوونی بكەوە و بیگەینە و بڵاوی بكەوە كە قورئان كەلامی پەروەردگارە نەوەك درووستكراو .

﴿وَلاَ تَكُ فِي الْقُرْآنِ بِالْوَقْفِ قَائِلاً﴾ پاش ئەوەی ئەبی داود لە دێڕەكانی پێشوو وەڵامی بیروباوڕی موعتەزیلی و كولابی و ئەشعەریەكانی داوە ئەوە لەم دێڕەش وەڵامی گروپێكی جەهمییەكان دەداتەوە بەناوی ( الواقفة ) و ئاگادار دەكاتەوە لە بیروباوڕیان بەرامبەر كەلامی پەروەردگار واتە : مەبەن بەو كەسانەی كە واقفیەكان بەرامبەری قورئان دەڵێن .

---

(1)سورة آل عمران , أية : 26.

**واقفيەكان كێن ؟**

**ئەو كەسانەن كە دەڵێن (فقالوا القرآن كلام الله ولا يقال مخلوق ولا غير مخلوق) واتە : قورئان كەلامی پەروەردگارە نە دەڵێین درووستكراوە نە درووست نەكراو . لەو نێوانە وەستاون كە بە جەهمیەكان كاریگەرن , بۆیە بەشێك لە ئەهلی سوننەت بە بەشێك لە جەهمیەكانی دەزانن جا بۆیە ئیمامی ئەبی داود دەفەرمووێت : وەك واقفیەكانیش مەبن لەبارەی قورئانەوە بەڵكو بە ڕوونی بڵێن : قورئان كەلامی پەروەردگارە لە دەنگ و پیت پێك هاتووە .**

**﴿كَمَا قَالَ أَتْبَاعٌ لِجَهْمٍ﴾ وەك شوێن كەوتووانی جەهم وا دەڵێن , جەهمی كوڕی سەفوان كە یەكێكە لە گەورەكانی جەهمیەكان كە بە ئەهلی ( التعطيل ) ناسراون سیفەتی پەروەردگار بە گشتی دادەڕنن وەك نەبوویەك دەیپەرستن , كە دیارە جەهم ئەم باوڕەی لە جەعدی كوڕی درهەم وەرگرتووە ئەویش لە ئەبانی كوڕی سەمعان وەرگرتووە ئەویش دیارە لە تالوتی كوڕی خوشكی لەبیدی ئەصەمی یەهودی وەرگرتووە كە لە یەهودیەكانی وڵاتی یەمەنە بەوەش بۆمان بەدیار دەكەوێت كە دامەزرێنەری بیروباوڕی جەهمیەكان یەهودییەكان بوونە بەڵكو جەهمیەكان حاڵیان خراپترە لە یەهودیەكان گەر سەیری قورئان بكەیت دەبینیت سیفەتی دەست بۆ پەروەردگار جێگیر دەكەن وەك پەروەردگار دەفەرمووێت ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا...﴾ [1] بەڵام جەهمیەكان ئەو سیفەتەش ناهێڵن بۆیە دەڵێم جەهمیەكان قێزەونترن لە یەهودیەكان و بەكڵۆ بگرە لە ئەشعەری و ماتوردیەكانیش .**

**﴿وَأَسْجَحُوا﴾ وە ئەوانەشی مەیلیان بۆیان دەچێت لە وتە و كردەوەی جەهمیەكان وە دڵ و دەروونت بپارێزە لەم گومانە پیسانە .**

---

(1).سورة المائدة , أية : 64.

﴿وَلاَ تَقُلْ : القُرْآنُ خَلْقٌ قَرَأْتُهُ﴾ وە مەڵێ : خوێندنی من بۆ قورئانەکە درووستکراوە ئەوەش وەڵامە بۆ بیدعەیەکی تر کە دەڵێن : خوێندنەوەی ئێمە بۆ قورئان درووستکراوە ئەوەش دیارە کۆمەڵێکی ترن لە جەهمیەکان وەك پێشەوای سوونـنەت ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت ﴿من قال لفظي بالقرآن مخلوق فهو جهمي، ومن قال غير مخلوق فهو مبتدع ﴾ [1] واتە : هەرکەسێ بڵێ خوێندنەوە و وشەی قورئان درووستکراوە ئەوە جەهمیە وە هەرکەسێ بڵێت درووستکراو نیە ئەوەش بیدعەچیە , مەبەستی واقفیەکانە لە نێوان درووستکرا و درووست نەکراو وەستاون

﴿فَإِنَّ كَلاَمَ اللهِ بِاللَّفْظِ يُوضَحُ﴾ ئەوەش بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەتە کە دەفەرموون کەلامی پەروەردگار بە خوێندنەوە وتە سیفەتی پەروەردگارە و ڕوون و ئاشکرایە .

**پوختەی ڕاڤە** : ئەبی داود دەفەرمووێت : بڵێ : وتەی پادشاکەمان کە پەروەردگارە درووستکراو نیە وەك چۆن پێشەوایانمان لە سەلەف وایان فەرمووە وە ئەوەش ڕاست و درووستە , وە وەك ئەوانەش مەبە کە واقیفین وەك چۆن شوێن کەوتووانی جەهمی کوڕی صفوانی جەهمی وادەڵێن وە ئەوانەشی مەیلیان بە لادا دەچێت , وە مەڵێ : خوێندنەوەی ئێمە بۆ قورئانەکە درووستکراوە بەڵکو بڵێن : سیفەتێك و کەلامی پەروەردگارە کە پێك هاتووە لە پیت و دەنگ وە ڕوون و ئاشکرایە .

---

(1).الفتاوى الحموية الكبري , ج : 2 ص : 213.

## إثبات رؤية الله تعالى

6 – وَقُلْ : يَتَجَلَّى اللهُ لِلْخَلْقِ جَهْرَةً كَمَا الْبَدْرُ لاَ يَخْفَى وَرَبُّكَ أَوْضَحُ
7 - وَلَيْسَ بِمَوْلُودٍ وَلَيْسَ بِوَالِدٍ وَلَيْسَ لَهُ شِبْهٌ تَعَالَى الْمُسَبَّحُ
8 - وَقَدْ يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ هَذَا وَعِنْدَنَا بِمِصْدَاقِ مَا قُلْنَا حَدِيثٌ مُصَرِّحُ
9 - رَوَاهُ جَرِيرٌ عَنْ مَقَالِ مُحَمَّدٍ فَقُلْ مِثْلَ مَا قَدْ قَالَ فِي ذَاكَ تَنْجَحُ

**﴿جیێگرکردنی بینینی پەروەردگار لە قیامەت﴾**

**بینینی پەروەردگار حەق و ڕاستیە پاڵ پشتە بە قورئان و سووننەت و کۆدەنگی زانایانی سەلەف کەس ئینکاری ناکات مەگەر جەهمیەکی کافر نەبێت , بۆیە سەلەف وەك پێشەوا شافعی دەفەرمووێت ﴿من أنكر رؤية الله حري أن يحرم منها﴾ [1] واتە : هەرکەسێ نکۆڵی بینینی پەروەردگار بکات ئەوە لە قیامەت لە بینینی خۆی بێ بەشی دەکات.**

**﴿وَقُلْ﴾ : بڵێ : کێ بڵێ ؟ ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری کردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەکان و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بڵێ :**

**﴿يَتَجَلَّى اللهُ﴾ پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەت خۆی نیشان دەدات بە ﴿لِلْخَلْقِ﴾ بڕواداران و یەك خوا پەرستان ﴿جَهْرَةً﴾ بەبێ هیچ پەردەیەك و بەربەستێك وەك چۆن ﴿كَمَا الْبَدْرُ لاَ يَخْفَى﴾ مانگ لە مانگی چواردە جوان و ڕوون دیارە وە هیچ شتێك ناتوانێت بیشارێتەوە هیچ پەلە هەورێك نیە ڕێگربێت لەبینینی وە هەموو شتێکیش بەیەکسانی دەیبینێت , بۆیە هەموو بڕواداران بەبێ هیچ نارەحەتیەك پەروەردگاری خۆیان دەبینن ﴿وَرَبُّكَ أَوْضَحُ﴾ بەڵکو بینینی پەروەردگار ڕوونتر و جوانتر دیارە لەو مانگە چواردەیە .**

---

(1)مجموع الفتاوى ج : 2 ص : 512.

ئەو دێڕانەی ئەبی داود هەڵێنجاوی فەرموودەکەی ئیمامی بوخاریە کە لە هاوەڵی خۆشەویست جەریری کوڕی عبداللە دەگێڕتەوە کە دەفەرموویێت : لای پێغەمبەری خوا بووین صلی اللە علیه وسلم سەیری مانگی چواردە شەوی دەکرد و فەرمووی ﴿إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ، كَمَا تَرَوْنَ هَذَا القَمَرَ، لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ﴾ [1] واتە : بەم نزیکانە پەروەردگاری خوتان دەبینن وەك چۆن ئەم مانگە چواردەیە دەبینن کە هیچ شتێك ڕێگری ناکات لە بینینی.

بەڵام تێبینیەك : چواندنی پەروەردگار بە مانگ نیە بەڵکو چواندنی بینینە بە بینین ئەم کافە ( کما ترون ) بۆ چواندنی بینینە بە بینین نەوەك لێکچوونی پەروەرگار بە مانگ حاشا بۆ پەروەرگار ئەوەش جێگری ئەوە دەکات کە بینینی پەروەردگار بە چاوی سەرە لە قیامەت بەڵام لە دونیان ناتوانین پەروەردگار ببینین چوونکە چاوکان درووست نەکراوە بۆ بینبنی پەروەردگار بەڵگەش داوای پێغەمبەر موسایە -علیه السلام- کە داوای کرد پەروەردگار بینێت وەك پەروەردگار دەفەرموویێت ﴿و قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [2] واتە : موسا وتی : ئەی پەروەردگارا خۆتم نیشان بدە ووتی : ئەی موسا ناتوانی هەرگیز من ببینیت بەڵام لەم چیایە بڕوانە من خۆمی نیشان دەدەم جا ئەم چیایە کە بونیەی لە تۆ بەهێزترە لە شوێنی خۆی ماوە و نەجولا ئەوکات تۆش دەتوانی من ببینیت , جا کاتێ پەروەردگار خۆی بە کێوەکە نیشاندا ورد و خاش بوو وە موساش بێ هۆش کەوت و بورایەوە , کاتێ بەهۆش هاتەوە ووتی : پاك و بێگەردی بۆتی پەروەردگار وە دوورم لەو شتەش کە تۆ لە کەدار دەکات وە من یەکەم بڕوادارم پێت لە ناو بەنی ئیسڕائیل .

(1)صحيح البخارى , كتاب : مواقيت الصلاة , باب : فضل صلاة العصر , ج : 1 ص : 115,برقم : 554.
(2)سورة الأعراف , أية : 143.

بۆیە زانایان دەفەرموون : هیچ کەسێك ناتوانێت لەم جیهانە پەروەردگار بەچاو ببینێت جا لێرە لە وشەی ( لن ) لای زانایان بۆیتە جێگای باس زەمەخشەری موعتەزیلی دەڵێت ( لن للتأبيد ) واتە بۆ هەتا هەتایە هەم لە دونیا هەم لە قیامەت بەڵام ئەهلی سوونەت دەڵێن : نا لێرە هەتا هەتاییەکە بۆ دونیایە نەوەك قیامەت چوونکە بینینی پەروەردگار بەم بونیە لاوازەی مرۆڤ ناتوانرێت ببینرێت چوونکە وەك پەروەردگار دەفەرموویت ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَار﴾ [1] واتە : هیچ چاوێك دەرکی ناکات و نابینرێت .

﴿وَلَيْسَ بِمَوْلُودٍ وَلَيْسَ بِوَالِدٍ﴾ لە هیچ کەسێك لە دایك نەبووە وە باوکیش نیە بۆ هیچ منداڵێك پاك و بێگەردە لەهەموو شتێك ئەوەش هەڵێنجاوە لە وتەی پەروەردگار کە دەفەرموویت ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ ﴾ [2] واتە : لە هیچ کەس نەبووە وە کەسیش لەو نابێت وە هیچ هاوشان و هاوبەشێکی نیە .

﴿وَلَيْسَ لَهُ شِبْهٌ ﴾ وە هیچ هاوشێوەیەکی نیە هیچ کەسێ نە لە سیفاتەکانی نە لە ناوەکانی نە لە کارەکانی هاوشان و هاوشێوەی ئەو نین بێ نیازە لە هەموو کەسێك و هەموو شتێك هەرخۆی خاوەن دەسەڵات و هەیبەتە بەسەر هەموو شتێك وەك خۆی دەفەرموویت ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [3] واتە : هیچ شتێك هاوشێوەی ئەو نیە وە هەر خۆی بیسەر و بینەرە وە دەفەرموویت ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيّاً ﴾ [4] واتە : ئاخۆ زانیوتە هاو ناوێکی هەبێت ؟ .

﴿تَعَالَى الْمُسَبَّحُ﴾ پاك و پێگەردی بۆ ئەو سوپاس کراوە کە بێ نیازە لە هەموو هاوبەشێك و هاوشێوەیەك .

(1)سورة الأنعام , أية : 103.
(2)سورة الإخلاص , أية : 3 .
(3)سورة الشورى , أية : 11.
(4)سورة مريم , أية : 65.

﴿وَقَدْ﴾ وشەی " قد " ئەگەر چوو بۆسەر فیعلێکی داهاتوو ( فعل المضارع ) بە چەند واتایەك دێت هەندێك جار بۆ کەمیە وەهەندێك جار بۆ زۆر وەهەندێك جا بۆ دڵنیاکردنەوە جا لێرە بەواتای دڵنیاکردنەوە دێت کە بەڕاستی ﴿يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ﴾جەهمیەکانن نکۆڵی بینینی پەروەردگار دەکەن ﴿هَذَا﴾ واتە : بینینی پەروەردگار ﴿وَعِنْدَنَا﴾ لای ئێمە ئەهلی سووننەت و جەماعەت ﴿بِمِصْدَاقِ مَا قُلْنَا﴾ ئەوە پشت ڕاست دەکەینەوە کە وتمان لە پێشتر لە جێگربوونی بینینی پەروەردگار ﴿حَدِيثٌ مُصَرِّحُ﴾ بە فەرموودەی جێگیر و درووست دوور لە قسە و بیروڕا بەڵکو پاڵپشتیمان قورئان و سووننەتە , شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرمووێت ﴿وهذا الحديث من أصح الأحاديث على وجه الأرض المتلقاة بالقبول ﴾ [1] واتە : ئەم فەرموودەیە لە ڕاسترینی فەرموودەکانە لەسەر زەوی کە لای گشت خەڵك وەرگیراوە , لای هەموو ئەهلی سوونە جێگای بەڵگەیە لەسەر بینینی پەروەردگار کە هیچ مەجالێك بۆ گومان ناهێلێتەوە ئەویش فەرموودەی :

﴿رَوَاهُ جَرِيرٌ عَنْ مَقَالِ مُحَمَّدٍ﴾ کە جەریری کوڕی عبداللە بەجەلی لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە کە ئەوەش فەرموودەکەیە :

حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَظَرَ إِلَى القَمَرِ لَيْلَةً - يَعْنِي البَدْرَ - فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ، كَمَا تَرَوْنَ هَذَا القَمَرَ، لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا .

کە لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلم و کتێبەکانی سووننە هاتووە کە لە پێشتر ڕاڤەی فەرموودەکەمان کردووە.

(1)مجموع الفتاوى لابن تيمية . ج : 6 ص : 213.

﴿فَقُلْ﴾ واته : ئەی خاوەن بیروباوڕی ئەهلی سوونەت بڵێ ﴿مِثْلَ مَا قَدْ قَالَ﴾ ئەوەی كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبارەی بینینی پەروەردگارەوە فەرموویەتی نەوەك وتەی جەهمیەكان بڵێیتەوە ﴿فِي ذَاكَ﴾ واتە : لە بینینی پەروەردگار ﴿تَنْجَحُ﴾ ئابەم جۆرە بیروباوڕە سەركەوتووی دونیا و دوارۆژ دەبیت .

پوختەی ڕاڤە : پێشەوا ئەبی داود دەفەرمووێت : وە بڵێ : پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەت بە ڕوون و ئاشكرایی خۆی نیشانی ئیمانداران دەدات , وەك چۆن هەورەكان ڕووناكی مانگ ناتوانێت بشارێتەوە پەروەردگار ڕوونتر بەدیار دەكەوێت ,هیچ كەسێك هاوشێوە و نمونەی وەك ئەو نیە , كە لەلایەن هەموو درووستكراوەكانی سوپاس كراوە , گەرچی جەهمیەكان نكوڵی لە بینینی پەروەردگار دەكەن لە ڕۆژی قیامەت , بەڵام لای ئێمە ئەهلی سوونەت و جەماعەت بینینی پەروەردگار پشت ڕاست دەكەینەوە بە بەڵگەی ڕاسترین فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

## إثبات صفة اليدين لله تعالى

10 - وَقَدَ يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ أيْضَاً يَمِيْنَهُ وَكِلتَا يَدَيْهِ بِالفَوَاضِلِ تَنْفَحُ

### ﴿ جيَگركردنى دەست بۆ پەروەردگار﴾

ئەم ديَرە ئەبى داود تيَيدا بەيانى جيَگربوونى دەست بۆ پەروەردگار دەكات وەك چۆن شايستەى خۆيەتى و شايەن بەوە , ئەهلى سووننەت دوو دەست جيَگير دەكەن بۆ پەروەردگار بەو شيَوەى كە شايەن بە خۆيەتى بەبىَ چواندن بە درووستكراوەكان وە بەبىَ دارِنين وەك سيفەتيَك لە پەروەردگار بەبىَ ئەندازە بۆ درووستكردن بۆى وەك چۆن شايستە بە گەورەيى و دەسەلاَتى خۆيەتى وەك پەروەردگار خۆى دەست بۆخۆى جيَگير دەكات ئيَمەش لەسەر ئەوە دەوەستين كە ئەو وەسفى خۆى پىَ كردووە وەك دەفەرموويَت ﴿مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَي﴾ [1] واتە : ئەى ئيبليس چ شتيَك ريَگرى لىَ كردوويت لەوەى كە سوژدە بۆ كەسيَك نەبەيت كە بەدەستى خۆم درووستم كردووە وە لە شويَنى تر دەفەرموويَت ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ [2] واتە : دەستى پەروەردگار لەسەرووى دەستى ئەوانە , وە لەشويَنى تر دەفەرموويَت ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا...﴾ واتە : يەهوديەكان دەيان وت : دەستى پەروەردگار داخراوە بەلَكو دەستى ئەوان داخراوە و نەفرەتيان ليَبيَت بەوەى كە دەليَن .

وە لە فەرموودەى پيَغەمبەر صلى الله عليه وسلم هاتووە كە دەفەرموويَت ﴿إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ...﴾ [3] واتە : دادپەروەران لاى پەروەردگار لە رِۆژو قيامەت لەسەر مينبەرانيَكى نورن لەدەستى پەوەردگارى ميهرەبانن .

---

(1)سورة ص , أية : 75.
(2)سورة الفتح , أية : 10.
( 3) صحيح مسلم , كتاب إمارة , باب فضيلة الإمام العادل , ج : 6 ص: 7, برقم : 1827.

دەيان ئايەت و فەرموودەی تر هەن لەبارەی بوونی دوو دەست بۆ پەروەردگار بەو شێوەی کە شایستەی خۆیەتی بەڵام لەبەر کورتی بابەتەکە تەنها ئەم چەند ئايەت و فەرموودەمان هێناوە بۆ بەڵگەکردنی ئەو بابەتەی کە باسی دەکەین , وە ئێمە وەك ئەهلی سووننەت و جەماعەت دوو دەست جێگیر دەکەین بەو شێوەی کە شایستەی خۆیەتی وە بەو شێوەی کە لە قورئان و سووننەت و تێگەیشتنی پێشین هاتوون جێگری دەکەین بەبێ چوواندن و ئەندازە بۆ دانان و دارِنین ..هتد

﴿وَقَدَ يُنْكِرُ الْجَهْمِيُّ أيْضَاً يَمِيْنَهُ﴾ جا ئەم سیفەتەش کە دوو دەستی پەروەردگارە بەهەمان شێوەی ڕابردوو نکۆڵی لێدەکەن و دای دەڕنن لە پەروەروردگار بۆیەش لێرە تەنها (يَمِيْنَ) دەستی ڕاستی هێناوە چوونکە ( شيمال ) دەستی چەپ لە فەرموودەی سەحیح نەهاتووە و جێگیر نەبووە بەڵام لەبەر گشتگیری ئایەتەکان هەردوو دەست جێگیربووە .

﴿وَكِلتَا يَدَيْهِ بِالفَوَاضِلِ﴾ ئەم دوو دەستەی پەروەردگار خێر و بەرەکەت و ئاسوودەیی و بەخشیش ﴿تَنْفَحُ﴾ دەبەخشێت بە بەندەکانی بەبێ ئەژمار و بەبێ جیاوازی .

پوختەی رأقە : دووبارە جەهمیەکان نکۆڵی لە سیفەتێکی پەروەردگار دەکەن کە هەبوونی دوو دەستی پەروەردگارە ئەو دوو دەستەی کە ئاسوودەیی و خێر و بەرەکەت دەبەخشێت .

## إثبات صفة النزول لله تعالى

11 - وَقُلْ : يَنْزِلُ الْجَبَّارُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ بِلاَ كَيْفَ جَلَّ الْوَاحِدُ الْمُتَّمَدِّحُ

12 إِلَى طَبَقِ الدُّنْيَا يَمُنُّ بِفَضْلِهِ فَتُفْرَجُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ وَتُفْتَحُ

13 يَقُولُ أَلاَ مُسْتَغْفِرٌ يَلق غَافِرَاً وَمُسْتَمْنِحٌ خَيْرَاً وَرِزْقَاً فَيُمْنَحُ

14 رَوَى ذَاكَ قَوْمٌ لاَ يُرَدُّ حَدِيثُهُمْ أَلاَ خَابَ قَوْمٌ كَذَّبُوهُمْ وَقُبِّحُوا

**﴿ جێگرکردنی سیفەتی هاتنە خوارەوەی پەروەردگار ﴾**

**ئەهلی سوونەت و جەماعەت وەك گشت سیفە تەکانی پەروەردگار ئەم سیفەتەش وەك چۆن لە قورئان و سوونەت هاتووە ئاوا جێگری دەکەن و چۆنیەتی دەگەڕینەوە بۆ پەوەردگار نە زیاد ڕاڤەی دەکەن نە کەمیش وەك ئەوەی لە قورئان و سوونەت هاتووە , بەڵێ پەروەردگار دێتە ئاسمانی دونیا بەڵام چۆن ؟ ئەوە نازانین تەنها ئەوە دەڵێین : بەڵێ دێتە خوارێ هاتنە خوارەوەشی وەك چۆن شایەن و شایستەی خۆیەتی وەك ئەوەی لە قورئان و سوونەتی سەحیح هاتووە .**

**﴿وَقُلْ﴾ : بڵێ : کێ بڵێ ؟ ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری کردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەکان و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بڵێ :**

﴿يَنْزِلُ﴾ ئەم وشەیە لە فەرموودەی سەحیحی متواتر کە زیاتر لە بیست و هەشت سەحابی قەدرگران دەیگێڕنەوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سیفەتی هاتنە خوارەوە بۆ پەروەردگار جێگیر دەکات کە دەفەرموویێت ﴿يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى ...﴾ [1] واتە : پەروەردگارم دادەبەزێت , گەر سەیری بکەیت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەم سیفەتە دەداتە پاڵ پەروەردگار , وە باشترین کەس کە لە زمان پاراوی بلیمەت و شارەزا بێت پێغەمبەری پەروەردگارە صلى الله عليه وسلم , وە باشترین کەس کە پەروەردگاری خۆی بەپاك ڕابگرێت پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم , بۆیە ئێمەش پاڵپشتی وتەی سەروەرمان صلى الله عليه وسلم ئەم سیفەتی هاتنە خوارەوەی پەروەردگار وەك چۆن شایەن بە خۆیەتی جێگری دەکەین .

﴿الْجَبَّارُ﴾ ئەوەش یەکێکە لە سیفەت و ناوی پەروەردگار بە پاڵ پشتی فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموویێت ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ **الْجَبَّارُ** الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [2] جەبار : بە دوو واتا دێت جارێك بە : چاکسازی واتە چاکسازی بە دەسەڵات و گەورەیی خۆی دەکات , وە جارێك بە : بەرزی و بەهێزی بەرامبەر ستەمکاران و تاغوتان .

﴿فِي كُلِّ لَيْلَةٍ﴾ لە هەموو شەوێك , ئەمەش بە بەڵگەی فەرموودە متواترەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموویێت ﴿...كُلَّ لَيْلَةٍ...﴾ لە هەموو شەوێك پەروەردگار دادەبەزێتە ئاسمانی یەکەم وەك چۆن شایەن و شایەستە بە خۆیەتی , وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کاتی هاتنە خوارەوەشی دیاری دەکات لە هەمان فەرموودەدا دەفەرموویێت ﴿حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ﴾ واتە : تاوەکو سێ یەکی کۆتایی شەو ئینجا پەروەردگار دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا .

---

(1)صحيح البخاري , باب التهجد بالليل ,ج : 2 ص : 53 , برقم : 1145.
(2)سورة الحشر , أية : 23.

﴿بِلاَ كَيْفَ﴾ بەبێ چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی , مەبەستی ئەبی داود لێرە ئەوەیە : زانستمان نیە بە چۆنیەتی هاتنە خوارەوە نەوەك مەبەستی نەفی چۆنیەتی پەروەردگار بێت , ئەوەی کە لای ئێمە نەزانراوە چۆنیەتی هاتنە خوارەوەیە , چونکە پەروەردگار خاوەن سیفاتە واتە : چۆنیەتی هەیە , بەڵام چۆنیەتی سیفاتەکان ئەوە تەنها ئەوە دەڵێن کە چۆن شایەن و شایستە بە خۆیەتی . پەروەردگار سیفەتەکانی دوورە لە سیفەتی درووستکراوەکانی هیچ شتێك هاوشێوە و هاوبەشی ئەو نیە لە سیفات و ناوەکانی وەك پێشەوا مالیك دەفەرموویێت ﴿وَالْكَيْفُ مَجْهُول﴾ [(1)] واتە : چۆنیەتەکەی نادیارە نەی ووت : چۆنیەتی نیە .

﴿جَلَّ﴾ واتە : پاك و بێگەردە و گەورەترە لەوەی کە ئێمەی درووستکراوی لاواز چۆنیەتی سیفاتەکانی بزانین تەنها ئەوە دەڵێن : وەك چۆن شایەن و شایستە بە خۆیەتی ﴿الْوَاحِدُ﴾ تاك و تەنهایە لە کارەکانی وە لە تەواوی سیفاتەکانی ﴿الْمُتَّمَدِّحُ﴾ ئەو کەسەی کە مەدح کراوە لەلایەن گشت درووستکراوەکانی .

﴿إِلَى طَبَقِ الدُّنْيَا﴾ هاتنە خوارەوەی پەروەردگار بۆ ئاسمانی ئەم دونیایەیە کە ئێمە تێیدا دەژین ﴿يَمُنُّ بِفَضْلِهِ﴾ منەت دەکات بەسەر بەندەکانی بەو هەموو بەخشیش و دیاری و نیعمەتانەی کە هەیەتی بەسەر بەندەکانی , ئەمەش پاڵ پشتە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە لەسەرەوە باسمان کرد کە لەبەشێکی فەرموودەکە دەفەرموویێت ﴿إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا﴾ کە پەروەردگار دێت بۆ ئاسمانی دونیا .

---

(1)العرش للذهبي ج : 1 ص: 189.

﴿فَتُفْرَجُ﴾ شەق دەبێت و دەكرێتەوە ﴿أَبْوَابَ السَّمَاءِ﴾ دەرگاكانی ئاسمان ﴿وَتُفْتَحُ﴾ وە گشتی لەسەر پشت دەكرێنەوە و والآ دەكرێن , ئەمەش پاڵ پشتە بە فەرموودەیەكی ئیمامی ئەحمەد لە فەرموودەی ئیبن مسعود كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت ﴿إذا كان ثلث الليل الباقي يَهْبط إلى السماء الدنيا، ثم يَفْتح أبواب السماء، ثم يَبْسُط يده فيقول: هل من سائل يُعطَى سُؤْله؟، ولا يزال كذلك حتى يَسْطَعَ الفجر﴾ [1] واتە : ئەگەر شەو گەیشت بە سێ یەكی كۆتایی ئەوە پەروەردگار دێتە خوارێ بۆ ئاسمانی دونیا , لە پاشاندا دەرگاكانی ئاسمان لەسەر پشت دەكرێنەوە و والآ دەكرێن , لەپاشان پەروەردگار دەستی دەستی ڕاستی خۆی وەك شایەن بە خۆیەتی دەكاتەوە وە دەفەرمووێت : ئایە داواكارێك هەیە داواكەی پێ ببەخشم ؟ بەردەوام وا دەبێت تاوەكو ڕۆژ هەڵدێت .

﴿يَقُولُ أَلاَ مُسْتَغْفِرٌ يَلقَ غَافِرَاً﴾ كاتێ دێتە خوارێ بۆ ئاسمانی دونیا دەفەرمووێت : ئایا داواكارێكی لێخۆشبوون نیە تاوەكو ئیمشەو بگات بە لێخۆشبەر ؟ ﴿وَمُسْتَمْنِحٌ﴾ كێ داواكاری بەخشیش دەكات ؟ تا پێی ببەخشم ﴿خَيْرَاً وَرِزْقَاً﴾ لە خێر و ڕزق و بەخشیش ﴿فَيُمْنَحُ﴾ تاوەكو گشت ئەو شتانەی پێ ببەخشم كە دەیانەوێت و ئاواتیانە .

﴿رَوَى ذَاكَ قَوْمٌ لاَ يُرَدُّ حَدِيثُهُمْ﴾ ئەم فەرموودەیە وشەی " ذَاكَ " ئاماژەیە بۆ فەرموودەی " نزول " ئەوەی لە پێشەوە ڕاڤەمان كرد , جا ئەم فەرموودەیە كەسانێك لە فەرموودەناسان و شەرع زانان و ئوسوڵیەكان هتد , ڕیوایەتیان كردووە و وەریان گرتووە و ڕەتیان نەكردۆتەوە ﴿أَلاَ خَابَ قَوْمٌ كَذَّبُوهُمْ وَقُبِّحُوا﴾ ئیلا كەسانێك ڕەتیان كردەوە و دۆڕاوبوون كە بە درۆیان دەزانی و بە شتێكی ناشرین و ناشایستەیان دەزانی .

---

(1)مسند الإمام أحمد برقم : 4248 , قال العلامة المحقق أحمد شاكر : إسناده ضعيف ولكن معناه صحيح.

**هەموو دێڕەکانی ئەبی داود هەڵقوڵاوی ئەم فەرموودەیە بوو کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت** ﴿يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي، فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ﴾ **واتە : پەروەردگاری ئێمە هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا لە سێ یەکی کۆتایی شەو دەفەرموویت : کێ داوام لێ دەکات ؟ تاوەکو وەڵامی بدەمەوە و پێی ببەخشم , کێ پێویستیەکی هەیە ؟ من پێی ببەخشم , کێ داوای لێ خۆشبوون دەکات ؟ تاوەکو لێی خۆش بم .**

**پوختەی ڕاڤە : ئەبی داود دەرموویت : بلێ : پەروەردگاری باڵا دەست دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا لە هەموو سێ یەکی شەو بەبێ چۆنیەتی دانان بۆی , بە بەخشین و لێخۆشبوونەوە هەموو دەرگاکانی ئاسمان دەکاتەوە و داوا لە بەندەکانی دەکات : ئایا کەسێك هەیە تاوانی کردبێت و من لێی خۆش بم ؟ وە خێر و بەرەکەت و ڕزقی بۆ برژێنم ؟ ئەم فەرموودەیە هەموو سەلەف وەریان گرتووە ئیلا کەسانێك نەبێت ڕەتیان کردۆتەوە کە دڵ و دەروون پیسن .**

## عقيدة أهل السنة في الصحابة

15 وَقُلْ : إِنَّ خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ مُحَمَّدٍ وَزِيرَاهُ قِدْمَاً ثُمَّ عُثْمَانُ الأَرْجَحُ
16 وَرَابِعُهُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ بَعْدَهُمْ عَلِيٌّ حَلِيفُ الْخَيْرِ بِالْخَيْرِ مُنْجِحُ
17 وَإِنَّهُمْ وَالرَّهْطُ لاَ رَيْبَ فِيهِم عَلَى نُجُبِ الْفِرْدَوْسِ بِالخُلْدِ تَسْرَحُ
18 سَعِيدٌ وَسَعْدُ وَابْنِ عَوْفٍ وَطَلْحَةٌ وَعَامِرُ فَهْرٍ وَالزُّبَيْرُ الْمُمَدَّحُ
19 وَقُلْ خَيْرَ قَوْلٍ فِي الصَّحَابَةِ كُلِّهِمْ وَلاَ تَكُ طَعَّانَاً تَعِيبُ وَتَجْرَحُ
20 فَقَدْ نَطَقَ الْوَحْيُ الْمُبِينُ بِفَضْلِهِمْ وَفِي الْفَتْحِ آيٌ فِي الصَّحَابَةِ تَمْدَحُ

**﴿ بیروباوڕی ئەهلی سووننەت لەبارەی هاوەڵان ﴾**

**ئەبی داود لەم چەند دێڕە پوختەی بیروباوڕی ئەهلی سووننەت دەچڕێت و کۆی دەکاتەوە لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە ئائەمە بیروباوڕی ئەهلی سووننەت و جەماعەتە لەبارەی هاوەڵان .**

**﴿وَقُلْ﴾ : بڵێ : کێ بڵێ ؟ ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری کردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەکان و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بڵێ :**

**﴿إِنَّ خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ مُحَمَّدٍ﴾ بەڕاستی باشترینی خەڵك لە دوای پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم ﴿وَزِيرَاهُ﴾ دوو وەزیرەکەیە کە : ئیمامی ئەبوبکر و عومەری کوڕی خەتابە ﴿قِدْمَاً﴾ واتە لە کۆنەوە لەسەرەتای بانگەوازی پێغەمبەرایەتیەوە وەزیر و هاوشان و هاودەمی پێغەمبەر صلی الله بوونە .**

دیارە نازناوی وەزیر بۆ ئەم دوو هاوەڵە خۆشەویستە پاڵ پشتە بە فەرموودەیەکی ئیمامی تورموزی کە لە هاوەڵی خۆشەویست ئەبی سەعیدی خودریەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموویێت ﴿مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ لَهُ وَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ وَوَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، فَأَمَّا وَزِيرَايَ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ فَجِبْرِيلُ وَمِيكَائِيلُ، وَأَمَّا وَزِيرَايَ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ فَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ﴾ [1] واتە : هیچ پێغەمبەرێك نیە ئیلا دوو وەزیر و کاربەدەستی هەبووە , دوو وەزیر لە خەڵکی ئاسمان و وە دوو وەزیر لە خەڵکی زەوی هەیە , وەزیرەکانی خەڵکی ئاسمان جوبرایل و میکائیلن , وە دوو وەزیرەکەی ئەهلی زەویش ئەبوبکر و عومەرن .

دیارە ئەم فەرموودەیە لاوازە و کاری پێ ناکرێت لەسەر فەزڵی ئەوان بەڵام فەرموودەی بوخاری و موسلم هەیە لەبارەی فەزڵی ئەبوبکر و ئیمامی عومەرەوە کە دیارە عەمری کوڕی عاس پرسیار لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەکات و دەفەرموویێت ﴿أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: «عَائِشَةُ»، فَقُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ فَقَالَ: «أَبُوهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ﴾ [2] واتە : چ خەڵکێك لای تۆ خۆشەویسترینە ؟ فەرمووی : عائیشە منیش وتم : ئەی لە پیاوان ؟ فەرمووی باوکی ووتم : ئەی کێی تر ؟ فەرمووی : عومەری کوڕی خەتاب . ئەوە بەڵگەی ڕوونە لەسەر فەزڵی ئەم دووانە لە دوای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

﴿ثُمَّ عُثْمَانُ الأَرْجَحُ﴾ لە پاشان لەسەر وتەی ئەرجەح پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان . خاوەن دوو نووری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە دوو کچی ئەوی لای بوو و زاوای ئەو بوو , ئەو کەسەیە کە فریشتەکان شەرمیان لێ دەرکرد , وە سێ یەمین خەلیفەی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم بە کۆدەنگی ئەهلی سوونەت و جەماعەت , کە خاوەنی چەندین فەزڵ و چاکە و منەتە بەسەر موسڵمانانەوە , هێنانی وشەی " لأَرْجَحُ" بەواتای ئەوە دێت ناکۆکی لە فەزڵ و خەلیفایەتی هەیە لای سەلەف و خەڵکانی تر بەڵام وتەی زۆرینە ئیمامی عوسمان پێش دەخەن بەسەر ئیمامی عەلی .

(1).سنن الترمذي ,ج : 6 ص: 57 , برقم : 3680 , حكم الحديث : ضعيف جدا .
(2) صحيح البخارى , كتاب : فضائل أصحاب النبي , ج : 5 ص : 5 برقم : 3662.

وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموویت ﴿منهم من قدم عثمان وهو قول الأكثرين من أئمة السلف ومنهم من قدم علياً، ومنهم من توقف، والذي استقر عليه أمر أهل السنة: أن ترتيبهم في الفضل هو كترتيبهم في الخلافة﴾ [1] واتە : هەندێك ئیمامی عوسمان پێش دەخەن كە ئەوە وتەی زۆرینەیە لە گەورە زانایانی سەلەف , وە هەندێكیش هەیە ئیمامی عەلی پێش دەخەن , وە هەندێكیش هەیە وەستاوە لە پێش خستن و دوا خستن , ئەوەی كە ئەهلی سووننەت لەسەری جێگربوونە ئەوەیە كە : ڕێكخستنی لەسەر فەزڵ وەك ڕێكخستنە لەسەر بوون بە خەلیفە بوونە .

﴿وَرَابِعُهُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ بَعْدَهُمْ﴾ وە چوارەمی كە باشترین درووستكراوە لەسەر گشت درووستكراوەكان لە دوای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئەبوبكر و عومەر و عوسمان ﴿عَلِيٌّ﴾ ئیمامی عەلی یە كە زاوا و ئامۆزای پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم , هاوسەری فاتیمەی زەهرایە و باوكی گەورەی گەنجانی بەهەشتە حەسەن و حوسەین ﴿حَلِيفُ الْخَيْرِ﴾ واتە : هەردەم لایەنی خێر و لەسەر حەق بووە ﴿بِالْخَيْرِ مُنْجِحُ﴾ وە هەمیشە بەهۆی خێر و چاكەوە سەركەوتوو و سەرفرازە

﴿وَإِنَّهُمْ وَالرَّهْطُ لاَ رَيْبَ فِيهِم﴾ وشەی " إنهم " جێناوی لكاوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار خەلیفەكە یاخود مەبەستی لەم شەش كەسەیە كە ناویان لە دواوە دێت بە هەموویان دەكەنە دە كەس كە ئەم دەكەسە لە دونیادا موژدەی بەهەشتی نەبڕاوەیان پێدرابوو كە ئەم كۆمەڵەیە هیچ گومانیان تێدا نیە ﴿عَلَى﴾ لەسەر ﴿نُجُبِ﴾ كۆی " نجیب " لە جوانترین ماڵ و خانوو و ئارامگەكانی ﴿الْفِرْدَوْسِ﴾ ناوێكە لە ناوەكانی بەهەشت بەرزتریت بەرگی بەهەشتە كە ئاسمانەكەی عەرش و كورسی پەروەردگارە.

---

(1).مجموع الفتاوى ج : 3 ص: 162.

وه ناوی له قورئان و سوونندت هاتووه پەروەردگار دەفەرموویت ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾ (1) واته : ئەو كەسانەی كه باوڕیان به پەروەردگار هێناوه و وه كردەوەی چاك دەكەن ئەوە بەهشتانێكیان له فیردەوس دەبێته شوێن و ئارامگەیان

وه پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت ﴿فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ، فَاسْأَلُوهُ الفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الجَنَّةِ وَأَعْلَى الجَنَّةِ - أُرَاهُ - فَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ﴾ (2) واته : ئەگەر داوات له پەروەردگار كرد ئەوە داوای فیردەوس بكەن , چونكه ناوەندی بەهەشته و وه بەرزترینی بەهەشته , لەسەرووی فیردەوسەوە كورسی پەروەردگار دەبینیت كه تێیدا سەرچاوەكانی ڕووباری بەهەشتی تێدا هەڵدەقوڵێت .

﴿بِالخُلْدِ﴾ مانەوەی هەتا هەتایی سیفەتێكی بەهەشته له دەیان ئایەتی قورئانی ئەم سیفەت هەتا هەتاییه باسكراوە ﴿تَسْرَحُ﴾ ئەگەڕێت به ویستی خۆت چێژ له بەخشیشەكانی پەروەردگارەوە دەبینیت بەسەر خۆتەوە كه منەتی لەسەر كردوویت , له پاشاندا دەفەرموویت ﴿سَعِيدٌ﴾ سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل  كوڕە مامی عومەری كوڕی خەتاب ﴿وَسَعْدُ﴾ سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص ﴿وَابْنِ عَوْفٍ﴾ عبدالرحمانی كوڕی عەوف ﴿وَطَلْحَة﴾ تەڵحەی كوڕی عبدالله ﴿وَعَامِرُ فَهْرٍ﴾ باوكی عوبەیدەی جەڕاح ﴿وَالزُّبَيْرُ﴾ زوبەیری كوڕی عەوام ﴿الْمُمَدَّحُ﴾ كه ئەمانه هەر هەموویان مەدح كراون و فەزڵ و گەورەیان باسكراوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم له دونیادا موژدەی بەهەشتی پێداون.

---

(1)سورة الكهف , أية : 107 .

(2) صحيح البخاري , كتاب : الجهاد والسير , باب : درجات المجاهدين في سبيل الله , ج : 4 ص : 16 برقم 2790

له فەر موودەی تورموزی و ئیبن ماجە کە عبدالرحمن کوڕی عەوف دەفەرموویت : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناوی دە کەسی هێنا و فەرموویت ﴿بُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي الْجَنَّةِ» فَقِيلَ لَهُ: مَنِ التَّاسِعُ؟ قَالَ: «أَنَا»﴾ [1] واته : ئەبوبکر له بەهەشتە , وه عومەر له بەهەشتە , وه عوسمان له بەهەشتە وه علی له بەهەشتە , وه تەڵحە له بەهەشتە , وه زوبەیر له بەهەشتە , وه سەعد له بەهەشتە وه عبدالرحمن له بەهەشتە , وترا بە عبدالرحمن کوڕی عوف ئەی نۆیەم کێ یە ؟ ووتی : منم .

﴿وَقُلْ خَيْرَ قَوْلٍ فِي الصَّحَابَةِ كُلِّهِمْ﴾ وە بڵێ ئەی دەست قایم به قورئان و سووننەت نەوەك بەس ئەم دە مۆژدە دراوە بە بەهەشت قسەی چاکیان لەسەر بکەیت بەڵکو گشت هاوەڵان بەبێ جودایی قسەی چاکیان لەسەر بکەیت چوونکە هاوەڵان گشتیان یەکسانن له دادپەروەری ﴿وَلاَ تَكُ طَعَّانَاً﴾ نەکەن تانە و تەشەرە بدەن له هاوەڵان ﴿تَعِيْبُ وَتَجْرَحُ﴾ عەیب و عاریان باس بکەیت و بریندداریان بکەیت وەك چۆن ڕافیزە شیعە کافرەکان باسیان دەکەن ﴿فَقَدْ نَطَقَ الْوَحْيُ الْمُبِيْنُ بِفَضْلِهِمْ﴾ چونکە بێگومان قورئانی ڕوون و دیار باسی فەزڵ و گەورەیی هاوەڵانی کردووه.

﴿وَفِي الْفَتْحِ آيٌ فِي الصَّحَابَةِ تَمْدَحُ﴾ له سورەی فەتح چەندین ئایەت شایەتە لەسەر فەزڵ و مەدحی هاوەڵان کە پەروەردگارلەسەرەنای سورەت دەفەرموویت ﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَاناً مَعَ إِيمَانِهِمْ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ له پاش ئەوە چەند ئایەتێکی تر دێن ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً﴾ وه دەفەرموویت ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ وه له کۆتایی سورەت دەفەرموویت ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً... ﴾ [2]

---

(1)سنن أبي داود , أول كتاب السنة , باب : في الخلفاء ج:5 ص:28.برقم : 4649.
(2) سورة الفتح , أيات : 4-10-18-29.

**پوختەی ڕاڤە** : ئەبی داود دەفەرموویێت : بڵێ : باشترینی خەڵك دوای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو وەزیرەكەی ئەبوبكر و عومەرە كە هەر لە سەرەتاوە پاڵپشتی ئەو بوونە , لەپاش ئەوان عوسمانی كوڕی عەفان لەسەر وتەی ئەرجەح , لە پاش ئەوە چوارەمی باشترینی خەڵك دوای ئەوان علی كوڕی ئەبی تالیبە , ئەوانە كۆمەڵێكن كە بەبێ هیچ گومانێك لەسەرووی بەهەشتەكانن كە فیردەوسە , لە پاش ئەوان سعید و سەعد و عبدالرحمن كوڕی عەوف و تەڵحە و عوبەیدەی كوڕی جەڕاح و زوبیری كوڕی عەوام دێت , كە ئەم دە كەسە بە فەرموودەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە , نابێت تانە و تەشەرە لە هیچ هاوەڵێك بدەیت بەبێ جیاوازی چوونكە هەردوو وەحیەكە قورئان و سوونەت مەدحی كردوون .



## الإيمان بالقدر

21 وَبِالْقَدَرِ الْمَقْدُورِ أَيْقِنْ فَإِنَّهُ          دِعَامَةُ عِقْدِ الدِّينِ، وَالدِّينُ أَفْيَحُ

### ﴿ باوڕبوون به قەزا و قەدەر ﴾

**ئەبی داود لەم دێڕە جێگری بنەمای شەشەم دەكات لە بنەمانی دین ئەویش " باوڕبوونە بە قەزا و قەدەر " كە لە فەرموودەی جوبرایل هاتووە كاتێ پرسیاری دەربارەی ئیمانی لێدەكات ئەویش یەكێك لە ڕوكنەكانی دەفەرمووێت : باوڕبوونە بە قەزا و قەدەر , ئیبن عومەر پیاوێك هاتە خزمەتی و پێی فەرموو** ﴿إن قبلنا قومٌ يقرؤون القرآن ويقولون إن الأمر أنفٌ ولا قدر. فقال ابن عمر: إذا لقيت أولئك فأخبرهم أني بريءٌ منهم وأنهم برآء مني ﴾ [1] **واتە : بە كەسانێك گەیشتین قورئانیان دەخوێند وە دەیان ووت : كارەكان بە سوتفەیە و قەدەر نیە , ئیبن عومەر قەرمووی ئەگەر گەیشتی بەو كەسانە هەواڵیان پێ بدە : من بەریم لەوان وە ئەوانیش بەرین لە من دواتر ئیبن عومەر سوێندی خوارد و فەرمووی** ﴿لو أن لأحدهم مثل أحد ذهباً فأنفقه ما قبل منه حتى يؤمن بالقدر، فإني سمعت أبي يقول: بينما نحن جلوس عند رسول الله صلى الله عليه وسلم وذكر الحديث﴾ [2] **واتە : ئەگەر ئێوە بەقەد كێوی ئوحود زێڕ ببەخشن لێتان وەرناگیرێت تاوەكو بڕوا بە قەدەر نەهێنن , چوونكە من گوێم لە باوكم بوو دەیفەرموو : لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دانیشتبووین .... فەرموودەی جوبریل . قەدەر ڕوكنی تەوحیدە ئەگەر هاتوو كەم تەرخەمی بكەیت لە باوڕبوون بە قەدەر ئەوە تەوحیدت هەڵوەشاوەتەوە وەك ئیبن عەباس دەفەرمووێت** ﴿القدر نظام التوحيد فمن وحد الله وكذب بالقدر فقد نقض تكذيبه توحيده﴾ [3]

**واتە : قەدەر ڕێكخستنی تەوحیدە هەركەسێ یەكخوا پەرست بێت و قەدەر بە درۆ بزانێت ئەوە بە درۆ زانینی قەدەر تەوحیدەكە هەڵدەوەشێنێتەوە.**





(1-2)صحيح مسلم , كتاب : الإيمان , باب : بيان الإيمان والإسلام والإحسان , ج : 1 ص: 28,برقم : 8.

(3) السنة لعبدالله بن الإمام أحمد ص : 928 , القدر للفريابي ص : 204 , الشريعة لأجري ص : 197 ,شفاء العليل ص : 65, روضة المحبين ونزهة المشتاقين ص : 61 , حكمه : أثر ضعيف .

**بۆیه هەرکەسێ قەدەر به درۆ بزانێت ئەوە کافربووە به پەروەردگار وەك پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموویێت ﴿القدر قدرة الله﴾ [1] واته : قەدەر دەسەڵاتی پەروەردگارە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە زۆر هاتووە لەسەر قەدەر نمونەی ئایەت وەك پەروەردگار دەفەرموویێت ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ [2] واته : ئێمە هەموو شتێکمان به ئەندازەکێشی درووست کردووە , وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت ﴿كُلُّ شئ بِقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزُ وَالْكَيْسُ﴾ [3] واته : هەموو شتێ به ئەندازە و قەدەرە تاوەکو دەستەوەسان و چاڵاك بوون , پێشەوا بوخاری دەفەرموویێت : ئیبن عەباس فەرمووی ﴿كل شيء بقدر حتى وضعك يدك على خدك﴾ [4] واته : هەموو شتێك به قەدەرە تاوەکو ئەو دەستەی لەسەر ڕوومەتت دایدەنێیت.**

**ئەبی داود دەفەرموویێت :**

**﴿وَبِالْقَدَرِ الْمَقْدُورِ أَيْقِنْ فَإِنَّهُ﴾ بەم قەدەرە توانا دارە دڵنیابە و گومانت نەبێت که ئەو ﴿دِعَامَةُ﴾ واته : دینگه و بناغەیە وە ﴿عِقْدِ الدِّينِ﴾ واته : ڕێکخستن و بناغەی ئیسلامە ﴿وَالدِّينُ﴾ وە ئەم دینەی ئیسلامەش ﴿أَفْيَحُ﴾ واته : فراوانە و هەموو کارێکی خێر له خۆ دەگرێت .**

(1)منهاج السنة النبوية لشيخ الإسلام إبن تيمية ج : 3 ص : 254.
(2) سورة القمر , أية : 49.
(3) مسند الإمام أحمد 5893 قال العلامة المحقق شعيب الأرنؤوط رحمه الله : إسناده صحيح على شرط مسلم. رجاله ثقات رجال الشخين، غير إسحاق الطباع- وهو ابن عيسى-، وعمرو بن مسلم- وهو الجَنَدي-، فمن رجال مسلم.مالك: هو ابن أنس، وزياد بن سعد: هو ابن عبد الرحمن الخراساني، وطاووس اليماني: هو ابن كيسان.وهو عند مالك في"الموطأ"899/2، ومن طريقه أخرجه البخاري في"خلق أفعال العباد"ص 25، ومسلم (2655) ، وابن حبان (6149) ، والبغوي في"شرح السنة" (73) ،والمزي في"تهذيب الكمال" 245/22، بهذا الإسناد.
(4) خلق أفعال العباد للإمام البخاري ص : 47.

**ئیمامی موزەنی بەڕەحمەت بێت دەفەرمووێت : چوم بۆ خزمەت ئیمامی شافعی بەڕەحمەت بێت لەسەرە مەرگ بوو لەبارەی قەدەرەوە لێم پرسی ئەویش فەرمووی :**

ما شئت كان وإن لم أشأ          وما شئت إن لم تشأ لم يكن
خلقت العباد على ما علمت          وفي العلم يجري الفتى والمسن
على ذا مننت وهذا خذلت          وهذا أعنت وذا لم تعن
فمنهم شقي ومنهم سعيد          ومنهم قبيح ومنهم حسن [1]

**ڕاڤەی ئەم شیعرەی ئیمامی شافعی :**

**(ما شئت كان) هەموو ئەو كارانەی دەیكەیت لە ژێر ویستی پەروەردگارە , هیچ شتێك نە سوود نە زیان بەتۆ ناگات ئیلا ئەو ویستی لەسەر بێت (وإن لم أشأ) هەموو ویستەكانی بەندەكان لە ژێر چاودێری و ویستی پەروەردگارە وەك پەروەدگار دەفەرمووێت ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [2] واتە : ئێوە ئارەزوو ناكەن ئیلا مەگەر پەروەردگار جیهانیان ئارەزووی لەسەر هەبێت (وما شئت إن لم تشأ لم يكن) ئەوەش دووبارە تاكید كردنەوەیە لەسەر ئەوەی كە ئەگەر ویستی پەروەردگار لەسەر كارەكان نەبێت هیچ شتێك ناكەوێتە دەست بەندەكانی (خلقت العباد على ما علمت) دروستكراو و بەندەكانم لە نەبوونەوە هێناومن بە بوون كە ئەوە لە زانستی پێش هات و دوا هاتی پەروەردگارە (وفي العلم يجري الفتى والمسن) مەبەستی : هەموو ئەو جولە و جولانەوەی لە مەخلوق ڕوودەدات لە زانستی پێش هات و دوا هاتی پەروەردگارە (على ذا مننت وهذا خذلت . وهذا أعنت وذا لم تعن) ئەوانە كارانێكن لە نێوان بەندەكان ڕوودەدات كە هەیە منەتی خۆی بەسەدرا كردووە لە باوڕ هێنان و گشت بەخشیشەكان , وە هەندێك تووشی بەد بەختی و شووم و هەڵخلیسكان بوونە و لە باوڕ و هیدایەت بێ بەش بوونە جا هەیە پەروەردگار یارمەتی دەدات وە هەندێكیش پشتی تێدەكات , كە درووستكار بۆ هەموو ئەوانە پەروەردگارە (فمنهم شقي ومنهم سعيد. ومنهم قبيح ومنهم حسن ) جا هەیە بەد بەختە وە هە یە بەختەوەر وە هەیە ناشرین و قێزەونە وە هەیە چاك و جوانە.**

(1) مناقب الشافعي (412/1، 413) ، شرح أصول اعتقاد أهل السنة (4/ 777)
(2) سورة التكوير , أية : 29.

**پێشەوای بڕوادارن عەلی کوڕی ئەبی تالب دەفەرموویت : لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بووین لە گۆڕستانی بەقیع لە شاردنەوەی تەرمێك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی** ﴿مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الجَنَّةِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ»، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَتَّكِلُ وَنَدَعُ العَمَلَ؟ قَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ: - فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالحُسْنَى - إِلَى قَوْلِهِ لِلْعُسْرَى﴾ [1] **واتە : هیچ کەسێك لە ئێوە نیە ئیلا پەروەردگار شوێنێکی لە دۆزەخ وە یان شوێنێکی لە بەهەشت لەسەرتانی نووسیوە , وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەواتە ئێمە دانیشن و لێی پاڵکەوین و دەست لەکارکردن هەڵگرین ؟ فەرمووی : کردەوە بکەن چوونکە هەمووتان بۆ ئەوە فەراهەم هێنراون کە بۆی درووستکراون , ئەگەر هاتوو لە خۆشبەختان بن ئەوە پەروەردگار کردەوەی ئەهلی خۆشبەختەکانتان بۆ فەراهەم دێنێت , وە ئەگەر لە بەد بەختەکان و تیاچووەکان بن ئەوە پەروەردگار کردەوەی بەد بەخت و تیاچووەکانتان بۆ فەراهەم دێنێت لە پاشان ئەم ئایاتانەی خوێندەوە...**

**پوختەی ڕاڤە : پێشەوا ئەبی داود دەفەرموویت : بەم قەدەرە تواناداره دڵنیابە و هیچ گومانێکت نەبێت چوونکە بڕوابوون بە قەدەر دینگەی تەوحیدە وە بناغەی تەوحیدە , وە ئەم دینەش فراوانە هەمو کارێکی خێر لە خۆوە دەگرێت .**

---

(1)صحيح البخاري كتاب : التفسير باب : سورة الليل ج : 6 ص : 170 برقم : 4945.

# الإيمان باليوم الآخر

| | |
|---|---|
| 22 وَلاَ تُنْكِرَنْ جَهْلاً نَكِيراً وَمُنْكَراً | وَلاَ الْحَوْضَ وَالْمِيزَانَ إِنَّك تُنْصَحُ |
| 23 وَقُلْ يُخْرِجُ اللهُ الْعَظِيمُ بِفَضْلِهِ | مِنَ النَّارِ أَجْسَاداً مِنَ الْفَحْمِ تُطْرَحُ |
| 24 عَلَى النَّهْرِ فِي الْفِرْدَوْسِ تَحْيَا بِمَائِه | كَحِبِّ حَمِيلِ السَّيْلِ إِذَا جَاءَ يَطْفَحُ |
| 25 وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ لِلْخَلْقِ شَافِعٌ | وَقُلْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ : حَقٌ مُوَضَّحُ |

## ﴿ باوڕبوون به ڕۆژی دوایی ﴾

**ئەمەش یەكێكە لە ڕوكنەكانی ئیمان كە باوڕبوون پێی واجیبە وەك پەروەردگار دەفەرمووێت** ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ.﴾ (1)

**واتە : چاكە هەرئەوە نیە تۆ ڕووبكەیتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا بەڵكو چاكە ئەوەیە كە باوڕ بە پەروەردگار بهێنێت و وە باوڕ بە ڕۆژی دوایی بهێنیت و وە بە فریشتەكانی وە بە قورئان و پێغەمبەرانی پەروەردگار وە ئەم ماڵە ببەخشیت كە زۆر لات خۆشەویستە بەسەر نزیكەكانت وە منداڵە بێ باوكەكان و هەژاران و ڕێبواران و داواكاران , بۆیە پێشەوا ئەبی داود بەڕەحمەت بێت لێرە بە كورتی و پوختی باسی ئەم بنچینە گرینگ و گەورەیە دەكات , كە زیاد لەوە هەڵدەگرێت بەڵام لەبەر كەمی كات و كورتی بابەت و وە لە ترسی درێژ نەبوونەوەی بابەتەكە لەم چوارچێوەی ئەم نەزم و ڕاڤە كورتە ئەبی داود تەنها ئەوەندە دەڵێت و ئێمەش تەنها ئەم كورتە لێكدانەوە و ڕاڤەیە دەكەین و دەڵێین :**

---

(1)سورة البقرة , أية : 177.

﴿وَلاَ تُنْكِرَنْ﴾ لێرە " لا " بۆ ڕێگری کردنە " الناهية " چۆتە سەر فیعلی موزارع کە بۆ ئێستایە کە قسەی تێدا دەکەین یان بۆ داهاتووە کە دێت ئەویش : نکۆڵی نەکردنە بەهۆی ﴿جَهْلاً﴾ ئەوە مفعول لاجلە یە واتە : لەبەر هۆکاری نەزانین و کەمی زانستت نکۆڵی مەکە لە هەبوونی ﴿نَكِيرًا وَمُنْكَرًا﴾ نەکیر و مونکەر کە دوو فریشتەی پەروەردگارە درووستکراون بۆ لێپرسینەوەی پرسیارەکانی گۆڕ لە مردووەکان دوو فریشتەی چاو قاوەیین و دەم و چاو ڕەشن و بە ترس و بێ سۆزن جێگربوونی ئەم دوو فریشتەیەش و هەبوونیان لە فەرموودەی تورموزی کە لە هاوەڵی خۆشەویست ئەبی هوریرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی ﴿اذَا قُبِرَ المَيِّتُ - أَوْ قَالَ: أَحَدُكُمْ - أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ، يُقَالُ لِأَحَدِهِمَا: الْمُنْكَرُ، وَلِلْآخَرِ: النَّكِيرُ﴾ [1] واتە : ئەگەر مردوو بخرێتە نێو گۆڕەوە یان یەکێك لە ئێوە ئەوە دوو فریشتەی دەم و چاو ڕەش و چاو قاوەیی دێنە لای بە یەکێکیان دەوترێت : مونکەر وە ئەوی تریان : نەکیر , باسەکە درێژە لەم فەرموودەیە کە پرسیارەکان چین و چۆن دەکرێن.

بۆیەش ناویان لێنراوە نەکیر و مونکەر لەبەر ئەوەی هیچ واسیتەیەك یان هیچ بەڵێنێك وەرناگرن لە مرۆڤەکان وە هیچ مایەی دڵخۆشی و جێگای پشت بەستنی مرۆڤەکان نین تەنها پرسیار دەکەن و وەڵام وەردەگرن بۆ بارەگای پەروەردگار وە ناویشان لێنراوە دوو فریشتە تاقی کەرەوەکان کە تاقی کردنەوەی بەندەکان دەکەن لە گۆڕەکانیان ., بۆیە باوڕ هەبوون بە نەکیر و مونەکەر واتە باوڕبوون بە ڕۆژی دوایی گەر باوڕت بەم دووانە نەبوو ئەوە تۆ نکۆڵی ڕۆژی دوایت کردووە , پیاوێك پرسیار لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکات دەڵێت ﴿هل نقول المنكر والنكير أم الملكين؟ قال: المنكر والنكير هكذا هو﴾ [2] واتە : ئایا بڵێین : نەکیر و مونکەر یان دوو فریشتە ؟ ئیمام فەرمووی : نا بڵێن نەکیر و مونکەر ئاوا هاتووە .

---

(1)سنن الترمذي برقم : 1071 قال العلامة المحقق أحمد شاكر : حديث حسن .

(2) شفاء العليل ص : 78,

بۆیه فەرمووده ئەم ناوەی بۆ جێگیر دەکات پێویسته لەسەرت بەم دوو ناوه ناویان بهێنیت وەك له سوونەتی سەحیح هاتووه بەڵام موعتەزیلیەکان که به عەقڵ بڕیار بەسەر شەرع دەدەن و باوڕیان به ئەم دوو فریشته و گشت سزاکانی گۆڕنیه دەڵێن : به هیچ شێوەیەك دوو فریشته نیه بەناوی نەکیر و مونکەر به پێی عەقڵی خۆیان ڕەتی دەکەنەوه , بۆیەش ئیمامی ئەبی داود دەفەرموویێت ﴿جهْلاً ﴾ نکۆڵی کردنەکه بەهۆی نەزانین و کەمی زانستەوەیه بۆیه نکۆڵی له نەکیر و مونکەر دەکرێت لەلایەن موعتەزیلیەکانەوه .

﴿وَلاَ الْحَوْضَ﴾ وه هەرگیز نکۆڵی له هەبوونی حەوز نەکەیت ئەو حەوزەی که پەروەردگار بۆ ئومەتەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئامادەی کردووه , پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم له وەسفی ئەم حەوزەدا دەفەرموویێت ﴿إِنَّ حَوْضِي أَبْعَدُ مِنْ أَيْلَةَ مِنْ عَدَنٍ لَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ بِاللَّبَنِ، وَلَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ النُّجُومِ﴾ [(1)] واته : حەوزەکەی من دووری نێوانی وەك نێوانی ئەیله و عەدەنه [(2)] ئاوەکەی سپی تره له بەفر , وه شیرینتره له هەنگوین به شیر پەرداغەکانی زۆرتره له ژمارەی ئەستێرەکان وه له " مسند " ئەبی داودی تەیالیسی زیادەیەکی سحیح هاتووه که پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموویێت ﴿مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا ﴾ [(3)] واته : هەرکەسێ قومێك ئاوی تێدا بخواتەوه پاش ئەوه هەرگیز تێنووی نابێتەوه ﴿وَالْمِيزَانَ﴾ وه نابێت نکۆڵی له هەبوونی تەرازووی کێشانی کردەوەکان بکەیت , هەبوونی بڕوا به تەرازوو له بنەماکانی ئەهلی سوونەت و جەماعەته که یەکێکه لەو شتانەی که که بڕوات پێی هەبوو ئەوه واته بڕوات به ڕۆژی دوایی هەیه بەڵام ئەگەر نکۆڵی له هەبوونی بکەیت ئەوه نکۆڵیت له ڕۆژی دوایی کردووه , بەڵگەش له قورئان و سوونەتی سەحیح و شوێنەواری سەلەف زۆره لەو بارەوه .

---

(1)مسند الإمام أحمد برقم : 19804 حكم الحديث : ضعيف .

(2) ئەیله و عەدەن دوو شاری گەورەن لەسەر بەحری قەلزم , ئیله له شیمالی وڵاتانی کەنداوی عەرەبه وه عەدەن دەکەوێته جنوبی وڵاتانی عەرەب .

(3) صحيح البخاری , کتاب : الرقاق باب : في الحوض ج : 8 ص : 120 برقم : 6.

**وەك پەروەردگار دەفەرموویت** ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ [1] **واتە : بێگومان ڕۆژی قیامەت ئێمە تەرازووی بەرامبەر دادپەروەریی دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین , ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێناکرێت چی لە چاکە کاری وە چی لە خراپەکاری , تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیان بە ئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلێکیش بێت کە لە بچوکیدا کراوە بە نمونە , وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین , وە بەڵگەی کێشان لە فەرموودەی سەحیحی ناودار فەرموودەی** (الْبِطَاقَةُ) [2] **لەبەر درێژی فەرموودەکە و کورتی باسەکە بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکانی ( السنن ) وە ئەسەرێك لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی** ﴿لَهُ لِسَانٌ وَكَفَّتَانِ﴾ [3] **واتە : ئەم تەرازووە زمانێك و دوو دەستی هەیە**﴿ **إنَّك تُنْصَحُ**﴾ **بەڕاستی من بۆ تۆ ئامۆژگارم .**

---

(1)سورة الأنبياء , أية : 47.
(2) سنن إبن ماجة برقم : 4300, قال العلامة المحقق شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح وقال العلامة المحدث المحقق أحمد شاكر : إسناده قوي .
39) شعب الإيمان ص : 447.

## ﴿ إخراج عصاة الموحدين في السعير ﴾

### دەرهێنانی یەكخوا پەرستە تاوانبارەكان لە دۆزەخ

ئەبی داود لەم دوو دێرە باسی دەرهاتنی ئەم یەك خوا پەرستانە دەكات لە دۆزەخ كە بەهۆی تاوانی گەورەوە كەوتوونەتە نێو دۆزەخەوە وە باسی دەرهاتنیان دەكات كە دوای خۆ شۆردن لە ئاوی ژیان دەچنە بەهەشتەوە , ئیمام دەفەرمووێت :

﴿وَقُلْ﴾ : بلێ : كێ بلێ ؟ ئەو كەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری كردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەكان و فەرموودە سەحیحەكانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بلێ :

﴿يُخْرِجُ اللهُ الْعَظِيمُ بِفَضْلِهِ﴾ پەروەدگاری گەورە بە منەت و فەزڵی خۆی كۆمەڵێ كەس دەردەهێنێت بۆ بەهەشت بەهۆی تكا كارێك كە خۆی ئیزنی داوە و لێی ڕازیە ﴿مِنَ النَّارِ أَجْسَاداً مِنَ الْفَحْمِ تُطْرَحُ﴾ لە دۆزەخ لاشە و جەستانێك كە بەهۆی تاوانی گەورەوە سووتاون و بۆنەتە ڕەژوو و برژاون ﴿عَلَى النَّهْرِ فِي الْفِرْدَوْسِ تَحْيَا بِمَائِهِ﴾ بۆ سەر ڕووبارێك كە سەرچاوەكەی لە بەهەشتی فیردەوسەوە زیندوو دەبنەوە بە ئاوەكەی وەك ﴿كَحِبِّ حَمِيلِ السَّيْلِ إِذَا جَاءَ يَطْفَحُ﴾ وەك : دەنكە گژوگیایەك كە لە بیابان لە حەشیش دەڕوێت كە وشك و ناشرین و داڕزاوە لەبەر گەرما بەڵام كاتێ بارانێك لێی دەدا سەوز دەبێتەوە و دەژێتەوە , كاتێ ئەم بارانە بە لێزمە دێتە خوارەوە بەسەریا دۆزەخیە یەكخوا پەرستە تاوانبارەكان وەك ئەم گژوگیایە وشكە بەم ئاوی ژیانەوە كە لەبەردەم دەرگای بەهەشتە و سەرچاوەكەی هەڵقوڵاوی كانیەكانی بەهەشتی فیردەوسە دەڕوێنەوە.

ئەوەش هەڵێنجێناوە لە فەرموودەی بوخاری و مسلم کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت ﴿يَدْخُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ. فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الحَيَا، أَوِ الحَيَاةِ - شَكَّ مَالِكٌ - فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ﴾ [1] واتە : بەهەشتیەکان دەچن بۆ بەهەشت و دۆزەخیەکانیش بۆ دۆزەخ , لە پاش ئەوە پەروەردگار دەفەرمووێت : دەریان بێنن لە دۆزەخ ئەو کەسانەی بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێك لە دڵیان باوڕ هەیە , پاش ئەم فەرمانە لە دۆزەخ دەردەهێنرێن کە ڕوو و جەستەیان تەواو سوتا و برژاوە لە پاشان دەیان بن بۆ سەر ڕووباری شەرم یان ڕووباری ژیانەوە , ئیمامی مالیك کە ڕاویە گومانی هەیە لەم دوو ناوە , دەژێنەوە وەك چۆن ئەم گژوگیایە دەژێتەوە بە هۆی ئەم بارانە بە لێزمەیە.

﴿وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ﴾ وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ﴿لِلْخَلْقِ﴾ بۆ درووستکراوەکان , مەبەست لە شەفاعەتی گەورەیە ﴿شَافِعٌ﴾ دەبێتە تکاکار کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە دەشتی قیامەت بۆ کۆمەڵێکی خەڵك دەیکات , وە فەرمودەی شەفاعەت کە دیار و بڵاوە فەرموودەی ( متواترە ) هەریەك لە هاوەڵان : ئەبوبکری ڕاستگۆ و ئیبن عومەر و ئیبن عەباس و ئەبی هوریرە و ئەنەس ...هتد دەیگێڕنەوە لەبەر درێژی فەرموودەکە ناتوانین لێرە باسی بکەین بۆیە بگەڕێنەوە بۆ کتێبی سوننە وە ﴿وَقُلْ﴾ بڵێ : ئەی ئەو کەسەی دەستت گرتووە بە قورئان و سوونەت ﴿فِي عَذَابِ الْقَبْرِ﴾ بوونی سزا و عەزابی گۆڕ ڕاستە و ﴿مُوَضَّحُ﴾ دیار و ڕوونە بە بەڵگەی قورئان و سوونەت .

**پوختەی ڕاڤە** : پێشەوا ئەبی داود دەفەرمووێت : نەکەی بەهۆی نەزانینەوە وەك نەزانەکان نکۆڵی لە هەبوونی دوو فریشتەی گۆڕ نەکیر و مونکەر و حەوز و تەرازووی ڕۆژی قیامەت بکەیت من بۆ تۆ ئامۆژگارم وە بڵێ : پەروەردگار بەهۆی سۆز و فەڵی خۆیەوە لاشەی کەسانێك لە یەك خوا پەرستانی تاوانبار لە جەرگەی دۆزەخ دەردەهێنێت وە دەیان دەخاتە ناو ئاوی حەیاتەوە و هەموو ماندوویی و سوتاویی لاشەیان پاك دەکاتەوە وە ئەوە بزانە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ کۆمەڵێك لە ئوومەتەکەی تکا کارە وە بڵێ : سزای گۆڕ ڕاستیە و بوونی هەیە

(1)صحيح البخاري , كتاب : الإيمان باب : تفاضل أهل الإيمان في الأعمال ج : 1 ص:13 برقم :22

## حكم مرتكب الكبيرة والتحذير من مذهبي الخوارج والمرجئة

26 وَلاَ تُكْفِرَنْ أَهْلَ الصَّلاَةِ وَإِنْ عَصَوْا فَكُلُّهُمُ يَعْصِي وَذُو الْعَرْشِ يَصْفَحُ
27 وَلاَ تَعْتَقِدْ رَأْيَ الْخَوَارِجِ إِنَّهُ مَقَالٌ لِمَنْ يَهْوَاهُ يُرْدِي وَيَفْضَحُ
28 وَلاَ تَكُ مُرْجِيًّا لَعُوباً بِدِينِهِ أَلاَ إِنَّمَا الْمُرْجِيُّ بِالدِّينِ يَمْزَحُ

**﴿ حوكمی خاوەنی هەلگری گوناهی گەورە وە ئاگاداركردنەوە لە مەزهەبەكانی خەوارج و مورجیئە﴾**

**ئیمامی ئەبی داود ڕەحمەتی پەروەردگاری لەسەر بێت لەم چەند دێڕە باس لە حوكمی خاوەنی هەلگری تاوانی گەورە دەكات كە یەكەم باس و خواس بوو كەوتە ناو ئومەتەوە كە كۆمەڵێ گرووپی تێدا لە ڕێڕەوەی ئەهلی سوونەت و جەماعەت لایان دا , سەرەتا باس لە بیروباوڕی ئەهلی سوونەت دەكات لەم بارەیەوە دواتر ئاگاداری دەدات لەو گرووپانەی لەم باسەدا لاڕێ بوونە وەك : خەوارج و مورجیئە .**

**دەفەرموویێت ﴿وَلاَ تُكْفِرَنْ أَهْلَ الصَّلاَةِ وَإِنْ عَصَوْا﴾ ئەم ( لا ) بۆ ( نەهیە ) واتە : باوڕت وانەبێت لەوەی كە تەكفیری ئەو كەسانە بكەیت كە نوێژخوێنن بەهۆی كردنی تاوانێكەوە ئەگەر خاوەنی تاوانی گەورەش بن , چوونكە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت ﴿مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَذَلِكَ المُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ﴾ [(1)] واتە : هەركەسێ نوێژی وەك نوێژەكانمان بوو وە ڕووی لە ڕووگەی ئێمە بوو , وە ئەو كەسەی قوربانیەكانمان دەخوات ئەوە موسڵمانە ئەو موسڵمانەی كە چۆتە ژێر زیمەتی الله تعالى و لەپاشان پێغەمبەرەكەی صلى الله عليه وسلم , واتە تەنها بە تەسلیم بوون دەچێتە ژێر زیمەی الله تعالى وە تەنها بە كردنی نوێژ دەبێتە ڕێگری لە تەكفیركردنی وە وشەی (أَهْلَ الصَّلاَةِ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەو كەسەی نوێژ نەكات كافرە چوونكە تا نوێژ بكات ئێمە دەست هەڵدەگرین لە تەكفیركردنی بەڵام كاتێ وازی لە نوێژ هێنا ئەوكات هیچ ڕێگریەكمان نابێت لە تەكفیركردنی**

---
(1)صحيح البخاري كتاب :الصلاة باب:فضل استقبال القبلةج:1 ص:87 برقم : 391.

﴿وَإِنْ عَصَوْا﴾ مەبەست لە تاوانە چ گەورە چ بچوك نەوەك مەبەستی کوفر و شیرك بێت ﴿فَكُلُّهُمْ يَعْصِي وَذُو الْعَرْشِ يَصْفَحُ﴾ هەموو نەوەی ئادەم سەرپێچی پەروەردگار دەکەن وە خاوەن عەرشی گەورە کە پەروەردگارە لێبووردە و میهرەبانە لە بەندەکانی کەواتە مافی تۆ نیە بەهۆی تەنها تاوانێکەوە تەکفیری بکەیت و بیخەیتە دۆزەخەوە ئەو پەروەردگارەی کە تاوانەکەی بەرامبەر کراوە لێی خۆش دەبێت تۆیەك هیچ مافت نیە دەرگاکانی لێخۆشبوونی بە ڕوویدا داخەی ﴿وَلاَ تَعْتَقِدْ رَأْيَ الْخَوَارِجِ﴾نەکەی باوڕت وەك باوڕ و وتەی خەوارج بێت لەم باسە , چوونکە خەوارج ئەو کەسانەیان کافر دەکرد و بە هەتا هەتایی لە دۆزەخیان وەسف دەکرد کە تاوانیان ئەنجام دەدا جا چ تاوانی گەورە چ تاوانی بچوك , وە خوارج ئەو کەسانە بوون کە : دەرچووبوون لە ئیمامەتی و خەلیفایەتی پێشەوا عەلی وە ئیمامی عەلی و عوسمان و دایە عائیشە و تەڵحە و زوبەیر و ئیبن عەباس و کۆمەڵێك لە هاوەڵانیان تەکفیر دەکرد ﴿إِنَّهُ مَقَالٌ لِمَنْ يَهْوَاهُ﴾ ئەوە ( تەکفیری خاوەنی گوناه ) وتەیەکە لە هەواو و ئارەزوو سەری هەڵداوە کە دوورە لە قورئان و سووننەت ﴿يُرْدِي وَيَفْضَحُ﴾ ڕەت دەکرێتەو و وە سەرزنشت و ئیهانە دەکرێت چوونکە پێچەوانەی دەقی قورئان و سووننەتە ﴿وَلاَ تَكُ مُرْجِيًّا لَعُوبًا بِدِيْنِهِ﴾ نەکەن وەك مورجیئەکان بن گاڵتە و گەپ بە دینەکەتان بکەن , پێشەوا ئەبی داود جوانترین وەسفی ئەم مورجیئانە دەکات بەوەی کە گەمە و گاڵتە بە دینەکەیان دەکەن وەك پێشەوا ئیبن بەتەی عوکبەری لە کتێبی ( الإبانة الصغرى – ص : 163 ) دەفەرموویێت ﴿ قال : رقبة بن مصقلة - أحد رواة البخاري : أما المرجئة فعلى دين الملوك ﴾ واتە : ڕەقبەی کوڕی مەسقەلە دەفەرموویێت : مورجیئە لەسەر دینی پادشاکانە , وە هەرکاتێ دین کەوتە دەست پادشاکان و دیوەخانی پادشاکان دەبێتە یاری و گەمە بەدەستیانەوە ﴿أَلاَ إِنَّمَا الْمُرْجِيُّ بِالدِّينِ يَمْزَحُ﴾ بەڕاستی کە مورجیئە گاڵتە و گەمە و یاری بە دین دەکات .

**پوختەی ڕاڤە : پێشەوا ئەبی داود دەفەرموویت : نەکەی ئەهلی نوێژ کافربکەیت ئەگەر هاتوو تاوان بکەن , هەموو مرۆڤێك تاوان دەکات وە خاوەن عەرشی گەورە کە پەروەردگارە لێبووردە و میهرەبانە , نەکەی باوڕت وەك خەواریجەکان بێت بەهۆی کردنی تاوانێکەوە خەڵك کافر بکەیت , چوونکە ئەوان لەم بابەتە دوورن لە قورئان و سوونەت بەڵکو لە هەوا و ئارەزووە نزیکن , وە نەکەی وەك مورجیئەکان گەمە و یاری بە دین بکەیت چوونکە بەڕاستی ئەوان گاڵتە بە دەقەکانی قورئان و سوونەت دەکەن .**



## تعريف الإيمان وزيادته ونقصانه

29 - وَقُلْ: إِنَّمَا الإِيمَانُ: قَوْلٌ وَنِيَةٌ وَفِعْلٌ عَلَى قَوْلِ النَّبِيِ مُصَرَّحُ
30 - وَيَنْقُصُ طَوْرَاً بِالْمَعَاصِي وَتَارَةً بِطَاعَتِهِ يَنْمِي وَفِي الْوَزْنِ يَرْجَحُ

**﴿ پێناسەی ئیمان و زیادبوون و کەم کردنی ﴾**

**پێشەوا ئەبی داود لەم چەند دێڕە باس لە پێناسەی ئیمان دەکات لەلای ئەهلی سوونەت و جەماعەت کە پوختەکەی پێکهاتووە لە : اعتقاد بالقلب : باوڕی دڵ , قول باللسان : وتنی بە زمان , عمل القلب والجوارح : کردەوەی دڵ و ئەندامەکان , ئەم سێ پایە دەوڵەمەندە بە بەڵگەی قورئان و سوونەت , ئیمام دەفەرمووێت :**

**﴿وَقُلْ﴾ : بڵێ : کێ بڵێ ؟ ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە قورئان و سوونەت و خۆی بەری کردووە لە ئەهلی بیدعە وە بڕوا و دڵنیابوونی تەواوی بە ئایەتەکان و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەیە , ئەم گشتگیریەی " وقل " واتە : بە زمان و باوڕی دڵت بڵێ :**

**﴿إِنَّمَا الإِيمَانُ: قَوْلٌ وَنِيَةٌ وَفِعْلٌ ﴾ ئیمان : وتە و نیەت و کردەوەیە جا کردەوەی دڵ و ئەندامەکان ئەوە ئەم پوختەیە کە باسمان کرد : اعتقاد بالقلب : باوڕی دڵ , قول باللسان : وتنی بە زمان , عمل القلب والجوارح : کردەوەی دڵ و ئەندامەکان , ئەوە پێناسەی ئیمانە لای ئەهلی سوونەت و جەماعەت , مورجیئەکان کردەوەی دڵ و ئەندامەکان لە پێناسەکە دەردەکەن هەر بۆیەش لاڕێ بوونە لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوونەت و جەماعەت (قَوْلٌ) وەك : خوێندنی قورئان و زیکر و یادی پەروەردگار و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ...هتد (نِيَةٌ) وەك : باوڕێکی ڕاست و درووستی دڵ کە ئەم نیەتە هەموو کارەکانی لەسەر بینا دەکرێت بۆیە دەبێت و نیەت و کردەوەکان یەك بن نەوەك نیەت کوفر بێت و وتە و کردەوە چاکە ئەوە پێناسەی دووڕووەکانە (فِعْلٌ ) دوو کردەوە هەیە : یەکەم : کردەوەی دڵ نمونە وەك : خۆش ویستن و ترس و ڕق لێبوونەوە و شەرم و تەوازع و پشت پێ بەستن ...هتد دووهەم : کردەوەی ئەندامەکان نمونە وەك : نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و جیهاد ...هتد**

﴿عَلَى قَوْلِ النَّبِيِّ مُصَرَّحُ﴾ ئەم سێ پایەی ئیمانە بە بەڵگەی وتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە سەریحی هاتوونە لەبەر كورتی شەرحەكە ناتوانین بەڵگەكان بهێنین لەبەر زۆری بەڵگەكان بۆیە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ كتێبەكانی ئەهلی علم لەم بارەوە .

﴿وَيَنْقُصُ طَوْرَاً بِالْمَعَاصِي﴾ ئەم ئیمانە بەهۆی تاوانەوە كەم دەبێتەوە وە ﴿وَتَارَةً بِطَاعَتِهِ يَنْمِي﴾ وە جارێكیش بەهۆی خودا پەرستی زیاد دەكات و گەشە دەكات , ئەم زیاد و بوون و كەم بوونەی ئیمان ئیجماعی ئەهلی سوونەت و جەماعەتی لەسەرە كە ئیمان بە تاوان كەم دەكات و وە بە پەرستش و یادی پەروەردگار زیاد دەكات ئەوەش پشت ئەستورە بە قورئان و سوونەتی سەحیحی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ﴿وَفِي الْوَزْنِ يَرْجَحُ﴾ وە لە ڕۆژی قیامەت لە تەرازووی كردەوەكان گران دەبێت بەهۆی عیبادەت كردن و دوور كەوتنەوە لە تاوان و خراپەكاری .

پوختەی ڕاڤە : پێشەوا ئەبی داود دەفەرموویت : لە پێناسەی بڵێ : ئیمان : وتە و نیەت و كردەوەیە ئەوەش بە بەڵگەی سەریحی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جێگیربووە , وە ئەم ئیمانە جارێك بەهۆی تاوانەوە كەم دەكات وە جارێی تریش بەهۆی گوێڕایەڵ و پەرستشەوە گەشە دەكات و زیاد دەكات , وە لە تەرازووی قیامەت كردەوەی چاك قورسی دەكات .

## التحذير من الرأي، ومن القدح في الحديث وأهله

31 - وَدَعْ عَنْكَ آرَاءَ الرِّجَالِ وَقَوْلَهُمْ     فَقَوْلُ رَسُولِ اللهِ أَزْكَى وَ أَشْرَحُ
32 - وَلاَ تَكُ مِنْ قَوْمٍ تَلَهَّوْا بِدِينِهِمْ     فَتَطْعَنَ فِي أَهْلِ الْحَدِيثِ وَتَقْدَحُ
33 - إِذَا مَا اعْتَقَدْتَ الدَّهْرَ يَا صَاحِ هَذِهِ     فَأَنْتَ عَلَى خَيْرٍ تَبِيتُ وَتُصْبِحُ

**﴿ ئاگاداربوون له ڕەئی پیاو وه تانه و تەشەره له فەرمووده و هەڵگرانی ﴾**

**پێشەوا ئەبی داود هۆشیاری دەدات بەوەی دوور بکەونەوە لە ڕەئی و دەست بگرن بە سووننەت و شوێنکەوتووانی کە دەفەرموێت :**

**﴿وَدَعْ عَنْكَ﴾ وازبێنه له ﴿آرَاءَ الرِّجَالِ وَقَوْلَهُمْ﴾ بیروباوڕی پیاو و قیل و قالەکانیان , وه دوور بکەویتەوە لەو تاقم و گرووپانەی کە عەقیدە و مەزهەبیان لەسەر قیل و قال و ڕەئی پیاو درووستکراوه وەك : ئەشعەریەکان و ما توریدییەکان و مورجیئەکان و خەواریجەکان ..هتد وەك پێشەوا و ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتاب دەفەرموێت ﴿إِيَّاكُم وَأَصْحَابَ الرَّأْيِ فَإِنَّهُم أَعْدَاءَ الدِّينِ﴾ [1] واته : دووربکەونەوە لە هاوەڵانی خاوەن ڕەئی بەڕاستی ئەوانە دوژمنی دینن , وه پێشەوای بڕواداران عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەفەرموێت ﴿لَوْ كَانَ الدِّينُ يَأْخُذُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ مَسْحُ بَاطِنِ الخَفِّ أَوْلَى مِنْ مَسْحِ ظَاهِرِهِ﴾ [2] واته : ئەگەر دین لە ڕەئیەوە وەرگیرابا ئەوە مەسح کردن لە ناوەوەی خوفەکە لە پێشتربوو لە مەسحی دەرەوەی , هۆکاری گومڕابوون و بڵاوبوونەوەی بیدعە و شیرك و خورافیات لەوەوە درووست بووە کە دین لە ڕەئی پیاوەکان وەرگیراوە و تەفسیر و ڕاڤە بۆ دەقەکان کراوە وە درووکەوتوونەتەوە لە قورئان و سووننەت بۆیە لاڕێ بوون و گومڕا بوون وە ئەو کەسانەی تەمەنێکیان لەناو زانستی جەدەل و مەنتیق و لۆژیك بەسەر بردووە لە کۆتایی تەمەنیاندا پەشیمانی و خەمیان لە تەمەنی با بردوویان خواردووە و خۆزگەی ئەوەیان خواستووە لەسەر بیروباوڕ و عەقیدەی ئەهلی سوونەت بژیابان**

---

(1) الدارقطني في سننه برقم (12)
(2) أبو داود برقم (162) ، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود برقم (162)

وە زۆرێکیان لە کۆتایی تەمەنیاندا تەوبەیان کردووە و گەڕانەوەتەوە سەر عەقیدەی سوونەت نمونە لەوانە : ئیمامی ئەبی حەسەنی ئەشعەری و ئیمامی حەرەمەینی جوەینی , قوتابیەکەی ئیمامی غەزالی و زۆرێك لەوانە کە بە نووسینی کتێب تەوبەکەیان ڕاگەیاندووە .

﴿فَقَوْلُ رَسُولِ اللّٰهِ﴾ وتە و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر و نێردراوی پەروەردگار صلى الله عليه وسلم ﴿أَزْكَى﴾ پاکتر و پرچێژتر و شیرینترە لە قیل و قالی خەڵکی ﴿وَ أَشْرَحُ﴾ ئارامتر و شیفاتر و ڕوونترە بۆ دڵ ﴿وَلاَ تَكُ﴾ ئەی خاوەن سوونەت و شوێنکەوتەی کەشتی هیدایەت ئەی ئەو کەسەی دەستت گرتووە بە وتەی باشترین درووستکراوەکان ئاگاداربە نەکەی ﴿مِنْ قَوْمٍ﴾ لەو کەسانە بیت کە ﴿تَلَهَّوْا بِدِينِهِمْ﴾ گاڵتە و گەمە و یاری بە دینەکەیان دەکەن و دین بە هەوا و ئارەزووی خۆیان ڕاڤە و تەفسیری بۆ دەکەن , مەبەستی ئەهلی بیدەع و گومڕاکانە ﴿فَتَطْعَنَ فِي أَهْلِ الْحَدِيثِ وَتَقْدَحُ﴾ کە بوختان و درۆ و تەعن لە ئەهلی حەدیس دەدەن وە بریندداریان دەکەن بە تانە و تەشەرە و ناو لێنان وەك : ئەشعەریە کولابیە پیسەکان بە ئەهلی سوونەت دەڵێن : **مجسمە** لەبەر ئەوەی سیفات و ناوەکانی پەروەردگار جێگیر دەکەن وەك چۆن لە قورئان و سوونەت هاتووە ﴿إِذَا مَا اعْتَقَدْتَ﴾ دانەر لە کۆتایی مەنزومەکە دەفەرموێت : ئەی ئەو کەسەی ڕێگای هیدایەتت دەوێت : ئەگەر هاتوو بیروباوڕت بە ﴿الدَّهْرَ﴾ درێژایی تەمەنت ئەو عەقیدە ڕاست و درووستە بوو کە من بۆتم باس کرد ﴿يَا صَاحِ﴾ کورتکراوەی ( صاحب ) ئەی هاوڕێکەم ﴿هَذِهِ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەم بنەما گەورانەیە کە لە مەنزومەکە باسکرا ڕێگای هیدایەت ئا تەنها لەم بیروباوڕەیە کە باسم کرد ﴿فَأَنْتَ عَلَى خَيْرٍ﴾ ئەوە بەڕاستی تۆ لەسەر باشترین بیروباوڕ و عەقیدە ﴿تَبِيتُ﴾ شەو ﴿وَتُصْبِحُ﴾ ڕۆژ دەکەیتەوە .

**پوختەی ڕاڤە** : ئەبی داود دەفەرموێت : وازبێنە و دووربکەوە لە ڕئی پیاوەکان وە قیل و قالەکان وتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پاکتر و ئارامی بەخشترە , لەو کەسانە مەبە کە گەمە و گاڵتە بە دینەکەیان دەکەن , لە ئەهلی بیدەع و گومڕاکان , وەك : ئەشعەری و خەواریج و مورجیئە و هتد لە گاڵتەکردنیان بە ئەهلی حەدیس و لە کەدارکردنیان ئەگەر هاتوو تا درێژایی تەمەنت ئەی هاوڕێکەم لەسەر ئەم بیروباوڕە بیت ئەوە تۆ لەسەر چاکترین و پاکترین بەرنامە و مەنهەج ڕۆژ و شەوت کردۆتەوە .

## كۆتایی

**پێشەوا ئەبی داود لە کۆتایی ئەم قەسیدەیە دەفەرمووێت :**

هَذَا قَوْلِي، وَقَوْلُ أَبِي، وَقَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ رَحِمَهُ اللهِ، وَقَوْلُ مَنْ أَدْرَكْنَا مِنْ أَهْلِ الْعِلمِ، وَقَوْلُ مَنْ لَمْ نُدْرِكْ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ مِمَّنْ بَلَغَنَا قَوْلَهُ، فَمَنْ قَالَ عَلَيَّ غَيْرَ هَذَا فَقَدْ كَذَبَ

**ئەوە وتەی منە , وە وتەی باوکیشم وە وتەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە وە وتەی ئەو کەسانەشە لە ئەهلی علم کە پێیان گەیشتووم وە وتەی ئەو کەسانەشە لە ئەهلی علم کە بە خزمەتیان نەگەیشتووم تەنها ئەوەی کە وتەکانیانم پێ گەیشتووە , هەر کەسێ شتێك بلێت بەسەرمانەوە جگە لەوەی کە باسمان کرد ئەوە درۆیە بەدەممانەوە .**

**كۆتایی نووسەر**

**الحمدلله نووسین و تەواو بوونم لە لێکدانەوەی ئەم مەنزومەیە لە پێنج ڕۆژدا کۆتایی پێ هات سەرتای نووسینم لە مزگەوتی فاتح لە نزیك گۆڕی محمدی فاتح لە ئیستەنبوڵ – تورکیا وە تەواوبوونم لە مزگەوتی کوجا تبە لە شاری ئیستەنبوڵ**

**لە 20 ذو الحجة – ساڵی 1440 کۆچی بەرامبەر 21 – 9 – ساڵی 2019 عیسایی**

**لەشەوی دووشەم دەستم پێکرد وە لە شەوی هەینی تەواوبووم**

**لەشەوێکی باراناوی دلگیر**

## ئیجازەی ئەم مەنزومەیە



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

الْحَمْدُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، الْأَغَرِّ الْأَكْرَمِ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى الصَّادِقِ الْأَمِينِ، النَّاطِقِ الْمُبِينِ مُحَمَّدٍ نَبِيِّنَا الْمُخْتَارِ، وَعَلَى إِخْوَانِهِ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ، وَأَهْلِ بَيْتِهِ الْأَبْرَارِ، وَأَزْوَاجِهِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَتَابِعِيهِمْ بِالْإِحْسَانِ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ، وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْهِمْ أَجْمَعِينَ. أَمَّا بَعْدُ :

فَإِنِّي العَبْدُ الفَقِير الي اللهِ خَادِمُ الكِتَابُ والسُّنَّة **هَاوْكَار بْنُ الجَواد بْن أَحْمَد الكُرْدِي** قَدْ سَمِعْتُ هَذا المَنظُومَة ( الحَائِيَّة فِي السُّنَة لِإمَامِ المُحَدَّث الحَافِظِ العَلاَّمَة أَبِي دَاوُدِ السِّجْستَانِي رَحِمَهُ الله) مِن أبو خَالِد وَلِيد بْن ادْرِيس بْن عَبْدُالعَزِيز المَنيسيّ السُّلَمِي وَسَمِعَ أَكْثَر مِن مِئَة الشِّيوخ , ثُمَّ أَقُولُ بِأَنَّ الأَخِ الفَاضِل ( ................................) قَدْ سَمِعَ مِنِّي هَذَا االمَنظُومَة وَإِنِّي أُجِيزَه بِهَذَا المَنظُومَة **بِسَنَدِ المُتَّصِل بِأَعْلَى الأَسَانِيد** الى لِإمَامِ المُحَدَّث الحَافِظِ العَلاَّمَة أَبِي دَاوُدِ السِّجْستَانِي رَحِمَهُ الله.

وَأَوْصِيْهِ بِالتَّمَسُّكِ بِكِتَابِ اللهِ تَعَالَى وَسُنَّةِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم , وَسُنَّةِ الخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ المَهْدِيِّين ,وَأَنْ يَتَخَلَّقَ بِأَخْلَاقِ طَلَبَةِ العَلْمِ الأَوْفِيَاءِ , وَيَتَأَدَّبَ بِأَدَابِ حَمَلَةِ القُرْأَن والسُّنَّةِ الأَتْقِيَاء وَيُجِلَّ مَشَايِخَهُ وَغَيْرَهُم مِنْ أَهْلِ العِلْمِ والفَضْلِ وَيَعْرِفَ لَهُم حَقَّهُم وَقَدْرَهُم وَيَنْشُرَ فَضَائِلَهُم وَيُمْسِكَ لِسَانَهُ مِنَ الوَقِيعَةِ فِيْهِم , وَأَوْصِيْهِ بِتَسْهِيلِ العِلْمِ لِمَنْ طلَبَهُ عَلَى سُنَنِ السَّلَفِ المَاضِيْنَ وَالأَئِمَّةِ المُتَقَدِّمِيْن , والعُلَمَاءِ الرَّاسِخِين , وَفَّقَنَا اللهُ جَمِيعَاً لِمَا يُحِبُّ وَيَرْضى.

المُجِيز

**هَاوْكَار بْنُ الجَواد بْن أَحْمَد الكُرْدِي**

# طَبَقَةِ السَّمَاع

## السند عن طريق الهندية

سمعت قراءة وتعليقا عن الشيخ المسند العلامة المحقق وليد بن إدريس المنيسي عن الشيخين عبدالقيوم الرحماني وظهير الدين المباركفوري كليهما عن :

1 - أحمد الله بن أمير البرتابكدهي الدهلوي 2- عن محدث الهند نذير حسين الدهلوي 3- عن محمد إسحاق الدهلوي 4- عن عبدالعزيز الدهلوي 5- عن الشاه ولى الله الدهلوي 6- عن أبي طاهر الكوراني 7- عن أبيه إبراهيم الكوراني 8- عن أحمد القشاشي 9- عن أحمد الشناوي 10- عن الشمس محمد الرملي 11- عن الزين زكريا الأنصاري 12- عن والده 13 – عن إبراهيم بن صدقة الحنبلي 14- عن عمر بن عبدالمحسن بن عبدالطيف بن رزين 15- عن أبي المحاسن يوسف بن عمر الختني الحنفي 16- عن الحافظين محمد البكري وعبدالعظيم المنذري 17- عن عمر بن محمد بن طبرزد 18- عن الشيخين أبي البدر إبراهيم الكرخي وأبي الفتح مفلح الدومي 19- عن الخطيب البغدادي 20- عن أبي عمر القاسم بن جعفر الهاشمي 21- عن أبي على محمد اللؤلؤي 22- عن الإمام أبي داود سليمان الأشعث السجستاني......المنظومة .

## سەرچاوەکان

یەکەم : قورئانی پیرۆز

دووهەم : کتێبەکانی سوونەت : صحيح البخاری و مسلم و سونەنی ئەبی داود و سونەی تورموزی و نەسائی و ئیبن و ماجە و موسنەدی ئیمام ئەحمەد و سونەی بەیهەقی و موتای ئیمام مالیك و شعب الایمان و صەحیحی ئیبن حیبان.

سێهەم : **مجموع الفتاوى ابن تيمية.**

چوارەم : **العرش للذهبي**

پێنجەم : **درء تعارض العقل والنقل.**

شەشەم : **السنة لعبدالله امام أحمد.**

حەوتەم : **شفاء العليل ابن قيم.**

هەشتەم : **مناقب امام شافعی للبيهقي.**

نۆیەم : **تهذيب الكمال للمزى.**

دەیەم : **خلق أفعال العباد للبخارى.**

یازدەهەم : **شرح السنة للبغوي.**

دوازدەهەم : **شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي.**

سێزدەهەم: **الشريعة للأجرى .**

چواردەهەم : **روضة المحبين.**

پازدەهەم : **السنة للمروزى.**

شازدەهەم : **التحفة السنية شرح الحائية لعبدالرزاق البدر.**

# پێرست



قَالَ الإِمَامِ الشَّافعي رَحِمَهُ الله : إِذَا رَأَيْتُ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ الحَدِيثِ فَكَأَنِّي رَأَيْتُ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلِّم

